# ژیاننامەی شێخ محەمەدی خاڵ و بیرەوەری


1978

شێخ محەمەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی حاجی شێخ ئەمینی خاڵە، کە بە پێنج پشت ئەگاتەوە مەلا مستەفا کە موفتی بابانەکان بووە و بەشداری کردووە لەدامەزراندنی شاری سلێمانیدا، پاش گواستنەوەی ئەمارەتی بابان لە قەڵاچوالانەوە بۆ سلێمانی لە ساڵی 1784دا لەگەڵ لێپرسراوانی ئەمارەتەکە.(مەلا مستەفا لەگەڵ خۆیدا دەستنووسەکانی واتە(مختوتەکان)ی هێناوە بۆ سلێمانی. ئەو دەستنووسانە لە باپیرە گەورەیەوە کە(مەلا ئەبوبەکری مصنف) بۆی ماوەتەوە. دوای خۆشی بۆ کوڕ و کوڕەزاکانی تاگەیشتۆتە دەست باوکم. ئێستا مێژووی بەشێك لەدەستنووسەکانی کتێبخانەکەی باوکم کە(636) دەستنووسە ئەگەڕێتەوە بۆ(350) ساڵ لەمەوبەر، کە لە باپیرە گەورەمانەوە بۆمان ماوەتەوە کە باوکم بەدەپشت ئەیگاتێ. مەلا ئەبوبەکری مصنف زانایەکی ئاینی بەناو بانگ بووە لە جیهانی ئیسلامیدا، خاوەنی موئەلەفاتی زۆرە کە بەشێك لەو موئەلەفاتە دەستنووسانە لە میسرو حجازو وڵاتانی ئیسلامی تردا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە چاپدراون.

ماموستا خاڵ لە ساڵی1904دا لە دایکبووە لەشاری سلێمانی لەبنەماڵەیەکی ئاینی ناودار لە کوردستاندا. لە ساڵی 1914دا باوکی بە نەخۆشی ئەمرێ، باپیری (حاجی شێخ ئەمینی خاڵ) کە پیاوێکی ناوداری خواپەرست بووە باوکم و هەرچوار براکەی بەخێوکردوون. سەرەتای خوێندنی لای باپیری بووە، لە قوتابخانەی باپیریا پەروەردەبووە بەراستگۆیی و دەستپاکی و خواپەرستی و قەناعەت و دوورکەوتنەوە لە هەڵپەی دنیا. حاجی شێخ ئەمینی خاڵ ئەوەندە زاهد بووە مەعاشی خەلافەتی عوسمانی وەرنەگرتووە. فایەق بەگی تاپۆ بەرەحمەت بێ کە لەچلەکانی سەدەی رابوردوودا سەرۆکی مەحکەمەی کەرکوك ئەبێت بۆ باوکی گێڕابوەوە ئەڵێت:"لە سەرەتای ساڵی 1918دا سکرتێری مێجەر نوئێل بووم کە حاکمی ئینگلیزبوو لە سلێمانی، رۆژێك پێی وتم بچۆ بۆ لای حاجی شێخ ئەمینی خاڵ و پێی بڵێ لە رۆژێکەوە کە هاتووینەتە ئێرە مانگی(200)رۆپیەمان بۆ بڕیوەتەوە، جوابمان بۆ ناردووە کە هەموو مانگێك یەکێ بنێرێ مانگانەکەی وەرگرێ، تا ئێستا کەسی نەناردووە بۆی. ئەمە(700)روپیە کە مانگانەی سێ مانگونیوێتی بۆی بەرە و پێی بڵێ کە لەمەولا بنێرێ بۆی مانگەو مانگ: فایەق بەگ ئەڵێ هەرچەندەم کرد رووم نەهات بچمە خزمەتی، چووم بۆ لای حاجی تۆفیقی تازە دەوڵەمەند کە مریدی حاجی شێخ ئەمین بوو کە بێ لە گەڵما، کە چووین پارەکەم لەبەردەمیا دانا و قسەکەی مێجەر نۆئێلم پێ وت، ئەویش پارەکەی فڕێ دایەوە بەردەمم وتی من لە خەلافەتی سوڵتان عبدولحەمیددا مانگانەم وەرنەگرتووە ئێستا لە ئینگلیز مانگانە وەرگرم. لە 8ی جمادی الاولی1337 کۆچی کە رێکەوتی 1918زاینی یە حوکمداری کوردستان خوالێخۆشبوو شێخ مەحمودی نەمر (50) روپیە مانگانەی بۆ حاجی شێخ

□ خالید محەمەد خاڵ

ئەمین بڕییەوە بەفەرمانێك. ئەم فەرمانەی بۆ نارد، وێنەی ئەو فەرمانە بە ئیمزاکراوی لە کتێبخانەکەی باوکما هەیە. بەڵام حاجی شێخ ئەمین ئەمەشی نەویست.

ماموستا خاڵ هەر لە منداڵییەوە عاشقی خوێندن و نووسین و خولیای کتێب و دەستنووس بوو. بەشی زۆری خوێندنی لای شێخ عومەری قەرەداغی بووە کە زانایەکی ئاینی گەورە بوو نەك هەر لە کوردستاندا بەڵکو لە ناو زانا ئاینییە عەرەبەکانی عێراقیشدا. بەشێکیش لە خوێندنی لای مەلا حسێنی پیسکەنی و شێخ جەلالی قەرەداغی بووە. لە ساڵی1931دا باپیری وەفات دەکات. ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ متصرفی سلێمانی ئەبێت، ئاهەنگێکی گەورە ئەگێڕێ لە مزگەوتی حاجی شێخ ئەمینی خاڵدا، هەرچی کاربەدەستانی ئەو ڕۆژەی دەوڵەت هەیە لەگەڵ پیاو ماقولانی سلێمانی بانگ ئەکرێن بۆ ئەو ئاهەنگەو تێیدا بە فەرمانی رەسمی، باوکم ئەکرێت بە أمام و مدرسی مزگەوتەکەی باپیری.

لە کۆتایی 1931تا کۆتایی1938شێخی خاڵ بەدەرس وتنەوە و پڕۆژەی دانانی فەرهەنگی خاڵ و ڕێزمانی کوردی و چەند کتێبێکی ئاینی وەك فەلسەفەی ئاینی ئیسلام و ژیانی پێغەمبەرەوە سەرقاڵ ئەبێت، لەم ماوە کەمەدا(2) کتێبی بەچاپ گەیاندووە. لە ساڵی 1939دا لە بەغداد بانگەوازی امتحانێك ئەکرێت لە لایەن وەزارەتی دادەوە، کە چەند قازییەکیان ئەوێت. باوکم یەکێك ئەبێت لەوانەی کە امتحان ئەدات، یەکەم ئەبێت لە ناو دەرچوواندا، بە فەرمانی مەلەکی ئەبێ بە قازی و لە هەڵەبجە دائەنرێت ئیتر ناچار دوورئەکەوێتەوە لە دەرس وتنەوە. لەو ماوە کەمەی کە بریتی بووە لە هەشت ساڵ باوکم بەدەرس وتنەوەوە سەرقاڵ بووە، توانیوێتی علومی ئاینی بە چەند کەسێك تەواو بکات، لەوانە ئەوەی لە یادمە مەلا مەحمودە کە ئێستا امام و مدرسی مزگەوتەکەی خۆمانە لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا نوری کە ماوەیەکی زۆر فەرمانبەربوو لە شارەوانی هەڵەبجە، هەروەها دەرسی بە براکانیشی وتووە، جگە لە کەسانی تریش کە دەرسی پێ وتوون وەك امام و مدرسی مزگەوتی حاجی حەسەنی لۆکە و مستەفا افندی رەحمەتی کە کاتبی سانەوی بوو، هەروەها مەلا عەبدولقادری واعز. لە ژیانی فەرنبەرێتیدا یەکێك بووە لە قازییە ناودارە شارەزاکانی عێراق، لە ماوەی(28)ساڵی وەزیفەیدا قازی بووە لە چەمچەماڵ و سلێمانی و کەرکوك و موصل. لە سەرەتای ساڵی1962دا لە ناو هەموو قازییەکانی عێراقدا ئەویان هەڵبژارد و کرا بە ئەندامی مەحکەمەی تەمیزی شەرعی لە بغداد. لەم ماوە زۆرەدا جێ پەنجەی زۆر دیاربووە لە وەزارەتی داددا، ناسراوە بەوەی کە بە هیچ جۆرێك لە یاساو شەریعەت لای نەداوە، هەرچەندە چەند جارێك لەلایەن کاربەدەستانی زۆر گەورەوە فشاریان خستۆتە سەر بۆ ئەوەی لابدات لە یاسا بەڵام هەمووی بێ سوود بووە. شێخی خاڵ لەبەرئەوەی نووسەرێکی خاوەن بیر و لێهاتوو خاوەن بەرهەمی زۆر و بەکەڵك بووە، بۆیە یەکێکە لەو کوردە زۆرکەمانەی کە لە زۆر زووەوە بووە بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری عێراقدا. تەنها خوالێخۆشبوو(تۆفیق وەهبی بەگ) لە پێش ئەوەوەیە لەم بوارەدا. شێخی خاڵ لە ساڵی 1953وە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقە، لە ساڵی1972ەوە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردیش بووە. جێ پەنجەی زۆر دیارە لە هەردوو کۆڕەکەدا، بەرهەمەکانی باشترین بەڵگەن لەم رووەوە. توانیویەتی خزمەتی نەتەوەکەی بکات لەبواری رۆشنبیریدا لەرێی هەردوو کۆڕی زانیارییەوە، ناوی گەورە پیاوانی کورد بگەیەنێ بە جیهان، وەك(مفتی زەهاوی) کە باوکی شاعیری گەورەی بەناوبانگ (جەمیل صدقی زەهاوییە) هەروەها بێتووشی و شێخ ئەحمەد فائزی بەرزنجی و بابە تایەری هەمەدانی و مەلا محەمەدی خاکی و کەسانی تریش).

گەورە پیاوان کە بەجێمان دێڵن زۆر زەحمەتە لە بیرمان بچنەوە، چونکە شێوەیان و رۆڵیان لە دەوڵەمەندکردنی رەوتی ژیاندا بەفیکر و رەوشتی بەرزوکاری مەزن هەرسات لەبەر دەممانداو و هەستی پێ ئەکەین. شێخی خاڵ یەکێکە لەو کەڵە پیاوانەی جێ پەنجەی دیارە لەبەرهەمە هەمە جۆرەکانیا کە رەسەنی بیر و زانیارییەکی زۆر و خۆشەویستییەکی بێ سنوور بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی تیا بەدی ئەکرێن.

ماموستا خاڵ کەسێتێکی کۆمەڵایەتی رەوشت جوان وزمان پاك و دڵفراوان و مێشك کراوە و لەسەرخۆبوو، تا رادەی خواپەرستی ئیمانی بە راستگۆیی و لێبووردن و رێزگرتن لە حەق و دادوەریی هەبوو، لەو قەناعەتەدابوو کە کوردایەتی خواپەرستییە، بۆیە لەناخی دەروونییەوە دژی هەموو جەور و ستەمێك بوو کە لەنەتەوەکەی ئەکرا، یەکەم وتاری لە گۆڤاری گەلاوێژدا لە کانوونی دووەمی 1940 لەژێر ناوی(خۆشەویستی نیشتمان)دایە. کەسانی تر ئەگەر تەنیا هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوە ئەنان بۆ بەربەرەکانی ئەو رژێمانەی کە بەردەوام بوون لە کاولکردنی کوردستان و زەوتکردنی خاکمان، شێخ محەمەدی خاڵ لەگەڵ هەستی نەتەوایەتیدا هەستی ئاینییش رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە زیادکردنی گڕو بڵێسەی تۆڵەسەندن تێیدا بەرامبەر دوژمنانی کورد و کوردستان، لەو باوەڕەدابوو کە ئەبێ ئاین وازعێکی نیشتمانی و نەتەوایەتیش بێ، خەباتی نیشتمانیش پێویستییەکی ئاینی بێ.

هەزاران سڵاو لە گیانی پڕشنگداری هەموو ئەو کەڵە نووسەرانەی کە لە سییەکانی سەدەی بیستەمەوە مەشخەڵی رۆشنبیریی و زانیارییان هەڵگرت لە هەموو بوارە جیاجیاکانی رۆشنبیریدا، هەموو توانایەکیان تەرخانکرد لە خزمەتی نەتەوەکەیاندا بە ئەو پەڕی هەستکردن بە بەرپرسیاری بێ ماندووبوون، گەورەیی ئەم خاوەن بیرانە لەوەدایە کە پێشڕەوبوون



لەچوونە ناو گۆڕەپانی خەباتەوە بە فیکر و قەڵەم بێ ئەوەی کەرەستەیەکی ئەوتۆیان لەبەردەمدا بووبێ کە شایانی باس بێت و کەمێ باری سەرشانیان سووک کات، جگە لە هیمەت ویستی پۆڵاینییان و خۆشەویستییەکی لەسنووربەدەری قەومەکەیان. بەقەڵەمەکەیان توانییان بەردی بناغەو کۆڵەکەی دامەزرێنەر بن لە بووژانەوەی کەلەپوور و زمانەوانی و وێژە و شیعر و مێژوو و ئاین و هەستی نەتەوایەتی و ئاستی زانیاری و رۆشنبیریی لە کوردستاندا.

نەمری بۆ ئەمین زەکی بەگ و تۆفیق وەهبی و رەفیق حیلمی و عەلادین سوجادی و مەلاعبدولکەریمی مدرس و پیرەمێرد و گۆران و بێکەس و هەژار و دڵدار و شێخ محەمەدی خاڵ و شاکر فەتاح کە جێی شانازی نەتەوەکەمانن و جێگایەکی فراوانیان گرتووە لە دڵ و ویژدانی نەتەوەکەیاندا و میللەتی کورد هەتا هەتایە ئەم گەورە پیاوانە لە یاد ناکات.

سڵاو بۆ هەموو خوێندەوارێکی کوردەواری کە دەستی قەڵەمی گرتبێ و شتێکی جوانی نووسیبێ(بیرەوەرییەکانم لەو رووداوانەی کە هەڵوێستی جوامێرانە و کوردانەی شێخ محەمەدی خاڵ) دەرئەخات.

نرخی وشەی ئازاو ئازاد(الكلمه الشجاعه والحره)لەوەدایە کە ئەبێ لە کاتێکدا بدرکێنرێ کە زۆر کە سانی تر لە ترسا نەوێرن دەری بڕن، جگە لەوەی کە ئەبێ پیاوانە ئامادەش بیت بۆ تەحەمولی بەرپرسیارییەکانی وشەکانت. بۆیە لەم جۆرە کاتانەدا وشەی ئازاد نرخی زۆربەرزە چونکە سانسۆری لەسەرە و لەژێر مەترسی دایە، بۆیە زۆر کاریگەرە چ لای دوژمنانی وشەی ئازاد و چ لای دۆستانی. بەشەرەکەش لەکۆتاییدا بە هەڵوێستەکانی ئەنرخێنرێ، بە پێچەوانەش لەبارودۆخێکدا کە مەترسی لەوتنی وشەی ئازاددانەبێت، ئەوسا وشەی ئازاد ئەو نرخەی نامێنێ، چونکە هەموو کەسێك ئەتوانێ بە ئەوپەڕی سەربەستییەوە بیڵێت بێ ئەوەی هیچ بکەوێ لەسەری و بەرپرسیاربێت لە ئەنجامی وشەکانی.

شێخ محەمەدی خاڵ یەکێك بوو لەوانەی کە لەجێی خۆیدا وەك پێویستییەکی نەتەوەیی و ئاینی و ویژدانی قسەی حەقی کردووە بەرامبەر کاربەدەستان، پێشەکی زانیویێتی کە ئەو قسانەیان بەدڵ نابێت و زویریان ئەکات، بێ گوێدانە ئەنجامی قسەکانی کە چی ئەکەوێت لەسەری، چونکە دڵسۆزی بۆ قەوم و نیشتمانەکەی لەسەرروو هەموو شتێکی ترەوە بووە. شێخی خاڵ ئەوەندە بەجەرگ بووە کە لە هێندێ کۆبوونەوەدا لەگەڵ کاربەدەستانی زۆر گەورەی عێراق رای دەربڕیوە و داوای لێکردوون کە لەگەڵ رۆڵەکانی کوردا کە چەکیان هەڵگرتووە رێکبکەون مافی خۆیانیان بدەنێ، چونکە لەهەر لایەك بکوژرێ چ پێشمەرگە چ عەسکەر هەرخوێنی ئەم میللەتەیە ئەرێژرێ بەخۆڕایی، هیچ ساتێك بەشەڕ هیچ کێشەیەك چارەسەرنەکراوە.

لەکاتێکدا کەویستیان زۆربەی گەڕەکەکانی شارەکەمان- دەرگەزین-چوارباخ-گۆیژە-مەڵکەندی- بەناوی تازەکردنەوەیان و درستکردنی باخ و باخات و دارستانی زۆر و شوقەی زۆر دروستکەن بۆ هاوولاتیان، ئەو گەڕەکانە بڕوخێنن و تەختیان کەن و دانیشتوانیان دەربەدەربکەن، مامۆستا خاڵ پێی وتن ئەمە تازەکردنەوەی شاری سلێمانی نییە، ئەمە کاولکردنی شارەکەمانە کە شاری زانست و ئەدەبە و شاری گەورە پیاوان و زانایانی مەزنی میللەتی کوردە. وا بەکورتی باسی هێندێ لەبیرەوەرییەکانمتان بۆ ئەکەم کە خۆم لە باوکم بیستووە بە ئەمانەتەوە، بەهیوای ئەوەی لە کاتێکی باشتر لە ئێستادا بتوانم پەردە لەسەر هێندێ رووداوو شتی گرنگ لابەرم و روونی کەمەوە بۆ هەمووان.

1-لەدوای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی کورد لە ئازاری 1974 دا حکومەتی بغداد بڕیاری دامەزراندنی حوکمی زاتی ئەدات لە کوردستاندا، لەکاتێکدا کە زۆربەی رۆڵە دڵسۆز و رۆشنبیرەکانی گەلەکەمان چووبوونە ریزی شۆڕشە مەزنەکەوە.

سەرۆکی عێراق ئەحمەد حەسەن بکر فەرمان ئەدات بە (نوری فیصل شاهر) کە ئەوساتە مدیری ئەمنی سلێمانی ئەبێ و لە پاشا بوو

بەوەزیری ئەوقاف و ئەندامی قیادەی قوتری عێراق کە پەیوەندی بکات بە شێخی خاڵەوە و بەناوی سەرۆکەوە داوای لێ بکات کە ڕەزامەندی دەربڕێ بۆ پۆستی ئەمینی گشتی ئەوقاف. لەو کۆبوونەوەیەدا لەنێوان مامۆستا خاڵ و بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی، شێخی خاڵ داوای لێبووردن ئەکات لێی و ئەڵێت کە تەمەنی ڕێ نادات بەو کارە هەڵسێت، جگە لەوەی کە بەردەوام سەری قاڵە بە نووسین و خوێندنەوەوە و نایەوێ لە کتێبخانە و مزگەوتەکەی دوورکەوێتەوە. نوری فیصل قەناعەت ئەکات بە وەڵامەکەی و ئەڵێت: ئەتوانی لە حەفتەیەکدا تەنیا دوو ڕۆژ تەرخان کەیت و تێیدا بچیت بۆ هەولێر و پێنج ڕۆژ لە ماڵی خۆت بیت. لەو ماوەی دوو ڕۆژەشدا ئیشوکاری ئەمانەتەکە بەرەبەڕێوە. ئەڵێ تۆ هیچ کێشەیەکت نییە، سەیارەی تایبەتی خۆتت هەیە بە شۆفێرەوە. لە هەولێریش خانووی دەوڵەتت بۆ ئامادەکراوە بە هەموو پێداویستییەکانیەوە. جارێکی تر شێخی خاڵ سوور ئەبێت لەسەر ئەوەی کە بەو شێوەیەش هەر ناتوانێ بەو کارە هەڵسێت، چونکە تەندروستی تەواو نییە. لەم مشتومڕەدا ناگەنە هیچ ئەنجامێك. ناچار نوری فیصل کۆتایی بە چاوپێکەوتنەکە دێنێ بە هیوای ئەوەی پاش ماوەیەکی تر بێتەوە لای و ڕەزامەندی خۆی دەربڕێ. جاری دووەم کە ئەچێتەوە لای ئەڵێت: باشە ئێمە ڕازین کە پێویست ناکات بچیت بۆ هەولێر، هەر لەماڵ و شاری خۆتا بە تەنیا حەفتەی ڕۆژێك جێگرەکەت لە هەولێرەوە دێت بۆ لات و چی نووسراوی ڕەسمی هەیە بۆت دێنێت بۆ ئیمزاکردن، خۆشت ئەتوانی لەگەڵیا ڕێکەوی و هێندێ دەسەڵاتی بدەیتێ. بۆ کاروباری گرنگیش کە رای تۆی دەوێت، جێگرەکەت بە تەلەفۆن پەیوەندیت پێوە ئەکات بۆ وەرگرتنی رات تێیدا. جارێکی تر مامۆستا خاڵ رازی نابێت. ناچار نوری فیصل ئەڵێ: جەنابی شێخ ئەم هەڵوێستەی تۆ هەر ئەوە ئەگەیەنێ کە تۆ بە هیچ جۆرێك ناتەوێ هاوکاریمان بکەیت. تۆ پیاوێکی بەڕێز و ناسراوی لە عێراقدا، من تۆم زۆر خۆش ئەوێت و نامەوێ خوانە خواستە تووشی کێشە و ناڕەحەتی ببی بە هۆی ئەم هەڵوێستەتەوە، چونکە دوایی خۆت بەرپرسیار ئەبیت. شێخی خاڵیش ئەڵێت: جەناب ڕاستە من خۆم بەرپرسیار ئەبم بەرامبەر بە هەڵوێستەکەم من حسابم بۆ ئەمە کردووە و بۆ هەموو ئەنجامێکیش. ئیتر واز لە باوکم دێنن و یەکێکی تر ئەکەن بە ئەمینی گشتی ئەوقاف.

2–لەساڵی 1979دا (صدام حسین) کە جێگری سەرۆکی دەوڵەت بوو فەرمان ئەدات کە سەیارەیەکی سوپەر بەدیاری بدرێ بە شێخ محەمەدی خاڵ. پارێزگاری سلێمانی ئەو کاتە ئەرشد زێباری بوو لەگەڵ سەرۆکی ڕێکخراوی بەعس لەو ڕۆژەدا ئەچن بۆ لای شێخی خاڵ و سڵاوی صدام حسێنی پێ ئەگەیەنن و پێی ئەڵێن کە جەنابی صدام ڕۆڵی مامۆستا خاڵ بە تایبەتی لە کۆڕی زانیاری عێراقدا ئەنرخێنێ، ئەشزانێ کە سەیارەی نییە وا هاتووین بۆ لاتان کە دیارییەکەی جێگری سەرۆك قبوڵ بکەیت. شێخی خاڵیش سووپاسیان ئەکات و ئەڵێت: لە ڕاستیدا پێویستییم بە سەیارە نییە، چونکە زۆربەی کات لە ماڵەوەم و بەنوسین و خوێندنەوەوە سەرم قاڵە. مانگی جارێکیش ئەچم بۆ بەغداد بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەکانی کۆڕی زانیاری عێراقدا، ئەویش سەیارەی خزمانم زۆرن کە لەگەڵیاندا بڕۆم، بۆیە پێویستم بە سەیارە نییە. ئەوانیش جارێکی تر دووپاتی ئەکەنەوە کە ئەبێ سەیارەکە وەرگرێت، نابێ کارێکی وا بکات کە جێگری سەرۆك لێی زویر بێت. باوکیشم ئەڵێت: شوکور وەزعم باشە ئەگەر پێویستیم بە سەیارە ببوایە ئەمتوانی بیکڕم، لەبەرئەوە پێشنیاز ئەکەم کە سەیارەکە بدەن بەیەکێکی تر کە لە من موستەحەق تر بێت. ئیتر هەڵئەستن و خواحافیزی لێ ئەکەن و ئەڵێن کەوا سەرت لێ ئەدەینەوە بە هیوای ئەوەی کە ڕات بگۆڕێ و خەڵاتەکە وەرگریت. جاری دووەم ئەچنەوە لای و ئەگەنە قەناعەتێك کە ئامادە نییە دیارییەکە وەرگرێت. ئەوانیش پێی ئەڵێن: تا ئێستاکە کەس نەبووە لە عێراقدا بتوانێ دیاری جێگری سەرۆك وەرنەگرێت، بۆیە تکای لێ ئەکەن کە کێشە بۆ خۆی و بۆ ئەوانیش دروست نەکات. مامۆستا خاڵیش ئەڵێت: وا بزانم کێشەکە هەر هی منە نەك هی ئێوە، منیش خۆم ئامادەم بۆ تەحەمولی. ئیتر ناچار پارێزگا و لێپرسراوی بەعس بۆ جاری دووەم بە نائومێدی خواحافیزی لێ ئەکەن بە هیوای ئەوەی کە جارێکی تریش بێنەوە لای بۆ هەمان مەبەست، لەو ماوەیەدا بە ڕێکەوت صدام حسین سەری شاری سلێمانی ئەدات و ڕۆژێك تێیدا ئەمێنێتەوە، لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانیدا لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت و حیزب، صدام لە پارێزگار و سەرۆکی ڕێکخراوی بەعس ئەپرسێت: ئایا شێخ محەمەدی خاڵ سەیارەکەی وەرگرت، ئەوانیش لە ترسا ئەڵێن بەڵێ قوربان، کە لە راستیدا وانییە، ئیتر بۆ سبەینێ بەهەڵەداوان ئەچنە لای باوکم و کلیل و سالانەی سەیارەکە ئەخەنە سەر مێزەکەی و ئەڵێن: ئیتر لەمە زیاتر لە وزەی ئێمەدا نەماوە، ئەوە کلیلەکە و سالانەکە خۆت بینێرەوە بۆی و بڵێ سەیارەکەم ناوێ. ناچار شێخی خاڵ سەیارەکە وەرئەگرێت.

3–لەسەرەتای هەشتاکاندا لیژنەیەك دێن لە بەغداوە کە بریتین لە بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانەی صدام–دەستنووسەکان/ و بەڕێوەبەرێکی گشتی لە دیوانی وەزارەتی راگەیاندن، لە سلێمانیش خوالێخۆشبوو مامۆستا ڕەفیق فتحولا کە بەڕێوەبەری مۆزەخانە ئەبێ ئەخەنە لیژنەکەوە و سێ قۆڵی ڕووئەکەنە ماڵی شێخ محەمەدی خاڵ بە هیوای ئەوەی بتوانن دەستنووسەکانی -مخطوطاتەکانی- کە 636 دەستنووسە لێی بکڕن. لیژنەکە تکا لە شێخی خاڵ دەکات کە دەستنووسەکانی بفرۆشێ پێیان بە (40) هەزار دینار بەمەرجێ دوای کۆتایی ژیانی دەستنووسەکان وەربگرن و بگوێزرێنەوە بۆ کتێبخانەی صدام لە بەغدا کە تایبەتمەندە بە دەستنووسەکان بۆ ئەوەی خوێندەواران بتوانن کەڵکی لێ وەرگرن، مامۆستا خاڵیش ئەڵێت: من لە ڕاستیدا خاوەنی ئەم دەستنووسانە نیم، چونکە نووسەرانی زۆری ئەم دەستنووسانە کوردن، ئەم دەستنووسانە موڵکی میللەتی کوردن، من تەنیا ئەیانپارێزم لە فەوتان. ماوەیەك هەوڵ ئەدەن کە قەناعەتی پێ بکەن کە بیفرۆشێ بەڵام هەمووی بێ سوود ئەبێت. لیژنەکە هەڵئەستن و ئەڕۆن کە سبەینێ بێنەوە بۆ لای. ڕۆژی دوایی دێنەوە و (40)

هەزارەکەی بۆ ئەکەن بە (50) پەنجا هەزار دینار. شێخی خاڵ دووپاتی ئەکاتەوە بۆیان کە جگە لەوەی کە مافی ئەوەی نییە کە ئەم دەستنووسانە بفرۆشێت، پێویستیشی بە پارە نییە تا بیر لە فرۆشتنیان بکاتەوە، ئەڵێت: "من بە درێژایی ژیانم کتێبێکم یا دەستنووسێکم نەفرۆشتووە ئەگەر پێویستیشم بووبێ، بە پێچەوانەوە بەردەوام ئامادەم کە دەستنووس بکڕم و بەشێکیش لە دەستنووسەکانم کریوە کاتی خۆی، لە ڕاستیدا سامانی بنەماڵەی خاڵ ئەم کتێبخانەیەیە". لەبەرئەوە تکام لێتانە ئەگەر سبەینێش دێنەوە بۆ لام بۆ هەمان مەسەلە پێویست ناکات عەزێت بکێشن، خۆ ئەگەر دێنەوە باسی دەستنووس و ئەدەب و ڕۆشنبیریی بکەین ئەوا بەخێربێن. لیژنەکە کۆتایی بە دانیشتنەکە دێنن و ئەڕۆن. پاش ماوەیەکی زۆر ئەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی و ڕووئەکەنەوە ماڵی مامۆستا خاڵ، یەکێك لە بەڕێوەبەرە گشتیەکان هەڵئەستێ و چەکێکی ئیمزاکراو ئەخاتە بەردەم باوکم و ئەڵێت: من دەسەڵاتم لە گەورەترین کەسەوە وەرگرتووە، ئەو چەکە لەبەردەمتایە بە ئیمزاکراوی چ مەبلەغێك پارە ئەنووسی لەسەری تۆ ئازادی خوای ئەکرد لە ملیۆن دینار زیاتر ئەبوو، ئێمە پەیمان ئەدەین کە لە حەفتەیەکدا پارەکەت بۆ بێنین. شێخی خاڵ چەکەکەی ئەداتەوە و ئەڵێ: "یەك لاپەڕەی دەستنووسێکم بەو پارەیە نادەم، من وامزانی لەو چەند کۆبوونەوەی کاتی خۆی کردتان لەگەڵما تێگەیشتبن لێم و گەیشتبنە ئەو قەناعەتەی کە زۆر شت هەیە بە پارە ناکڕێ چونکە زۆر لە پارە بەنرخترە. ئێوەش ئەبێ پیاوی خۆتان بناسن" ئیتر لیژنەکە بە نائومێدی ئەگەڕێنەوە بۆ بەغدا. مامۆستا ڕەفیق فتحولڵا -بەرەحمەت بێ- پاش ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم مەسەلەیەدا بۆی گێڕامەوە و وتی کاتی خۆی من زۆر بەسەر لیژنەکەدا هاتم و پێم وتن ئێوە شێخ محەمەدی خاڵ ناناسن وەك من. ئەم پیاوە پارە و ماڵی دنیای لا مەتڵەب نییە، دەستنووسەکانی زۆر خۆش ئەوێت و بوون بە بەشێك لە کیان و ژیانی ڕۆژانەی، لەبەرئەوە بڕواناکەم لە هەوڵدانەکاندا لەگەڵیا بگەنە هیچ ئەنجامێك.

4-شێخی خاڵ و پرۆگرامی ڕۆژانەی تا دوا هەناسەی لە میحرابی نووسین و خوێندنەوە و بیرکردنەوەدا بردەسەر. هەستکردن بە خۆشی و لەزەتی ژیان لای لەسەرقاڵبوونی بەردەوامی بوو بە نووسین و ئەنجامدانی بەرهەمەکانی و دانانی پرۆژە بۆ بەرهەمی تازە. لەم ڕەوتە پیرۆزەدا کە (55) ساڵی خایاند نەك هەر هەستی بە ماندووبوون نەئەکرد، بەڵکو زیاتر لە گورسەندنەوەدا و باشتر لە جاران چالاکی ئەنوان، هەرگیز دانی بەوەدا نەئەنا کە چۆتە تەمەنەوە، هەرچەندە تەمەنیش ئەحکامی خۆی هەیە. لەو ماوە کەمانەش کە ڕۆژانە تەرخانی کردبوو پشووی تێدا بدات و دوورکەوێتەوە لە خوێندنەوە و نووسین ئێواران بوو کە ئەچوو بۆ ساڵۆنە ئەدەبییەکەی لە مزگەوتەکەی کە پڕ ئەبوو لە پیاو ماقوڵان و شاعیر و ڕۆشنبیران، کۆڕەکە جارێکی تر ئەبووەوە بەکۆڕێکی ئەدەبی و زانیاری، هەموو لایەك کەم و زۆر لە ئامادەبووانی مەجلیسەکەی سوودبەخش ئەبوون. شێخ محەمەدی خاڵ کات لای زۆر گرنگ بوو، ڕێکوپێك بوو لە ئیشوکاری ڕۆژانەیدا، تا مرد بەقەدەر توانا پەیڕەویی ئەکرد. ڕۆژانە (10) سەعات بە نووسین و خوێندنەوەوە خەریك ئەبوو بێ لادان لەم پرۆگرامە تا مردن.

سەرەتای خوێندنەوەی لە مەلا بانگانەوە تا نزیك نیوەڕۆ بوو کە ئەیکردە نزیك شەش سەعات لە دنیای کتێب و دەستنووسدا، عەسرانیش پێش ئەوەی بڕوا بۆ مزگەوت سێ سەعاتی تر بەردەوام ئەبوو لە موتاڵا و پیاچوونەوەی مەلزەمەی ئەوکتێبانەی کە لەژێر چاپدا بوون و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی. شەوانیش پێش نوستن ماوەی سەعاتێك بە خوێندنەوەوە خەریکبوو. لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە یەك چاوی مابوو، ئەو تاکە چاوەش لە ڕاستیدا لە حوکمی لەتەچاوێکدا بوو، چونکە بەردەوام چاویلکە و زەرەبینی بەکارئەهێنا بۆ خوێندنەوە. زۆرجار مناڵ و براکانی و خزمان دەوریان ئەدا و تکایان لێ ئەکرد کە بەزەییەکی بەخۆیدا بێتەوە و ئاگایەکی لە تەندروستی خۆی بێت و ئەوەندە خۆی هیلاك نەکات. پێمان ئەوت شوکور لە سایەی خواوە بەفەدەر دە نووسەر بەرهەمت هەیە و دووپاتمان ئەکردەوە بۆی کە ئاگای لەو لەتەچاوەی بێ و لەوە زیاتر ماندووی نەکات. بە پێکەنینێکەوە وەڵامی ئەداینەوە و ئەیوت: (تەندروستیم بەندە بە خوێندنەوە و نووسینەوە ئەگەر دوورم خەنەوە لێی نەك هەر تەندروستیم خراپ ئەبێت، لەوانەشە بمرم. من وەك ماسی چۆن کە لەئاو دەرتهێنا ئەمرێت، منیش دوورم خەنەوە لە کتێب و نووسین ئەوا ئەبێ ماڵئاوایتان لێ بکەم. بۆ لەتەچاوەکەشم، توخوا چاوێك لەم ڕێگایەدا کوێر نەبێت بۆچی باشە). من بەش بە حاڵی خۆم تا مردن ئەو دیمەنەم لەبەرچاوە کە لە کۆتایی ساڵی 1987دا کە ڕوناکی لە چاوی باوکمدا نەما، ڕۆژێك داوای لێکردم کە دەستی بگرم و هەڵیسێنم و بیبەمە ژورەکەی خۆی کە کتێبخانەکەی تێدا بوو، منیش بردمە ژوورەکەی، وتی دەستم بخەرە سەر کتێبەکانم، دەستیم بەرزکردەوە تا گەیشتە ئاستی کتێبەکان ماوەیەك دەستی خست لە کتێبەکانی، هەستم کرد زۆر بێ تاقەت بوو کە سەیرم کرد فرمێسك بە چاویا دێتە خوارێ و زۆر بەهێواشی ئەگریا، ماوەیەك لەو حاڵەدا مایەوە، ئینجا فەرمووی بمبەرەوە سەرجێگەکەم.

**سەرچاوە**

گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (29)ی حوزەیرانی (2002).

# ئاوڕێکی خێرا لە شاکارەکانی شێخ محەمەدی خاڵ


1965

دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا قەڵەمێکی باڵازراڤ بەسەر سنگی پەرەسپیەکانی مێژووی نەمریەوە چاوەکانی لێك نا، دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا دڵێکی گەورەی پڕ لە عیرفان و ڕۆشنگەری لە لێدان کەوت و زەنگی کۆستێکی ئیقلیم گیر کوردستانی داچڵەکاند، بەڵێ دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا لە ڕۆژێکی وادا، مەلی ڕۆحیانەتی سپی و نورانی شێخ محەمەدی خاڵ دای لە شەقەی باڵ و بۆ دواجار کوردستانی بەفرو خوێن و سوتماکی بەجێ هێشت و ئێمەش ئێستا سەدان پەپوولە وشەی باڵ نەخشینی ڕێزو وەفا هەڵئەفڕێنینە نێو باخچە ئاڵ و واڵاکەیەوە.

یادکردنەوەی ئەم کەڵە زاناو بلیمەتە کوردانەی وەك نالی و پیرەمێردو مەولانا خالیدو شێخ محەمەدی خاڵ، لەلایەن بنکەی گەلاوێژەوە کارێکی هەروەها لەخۆوە نییە، بەڵکو پرۆگرامێکی توکمەو تایبەتی بنکەکەمانە (بنکەی گەلاوێژ)و مەبەست لە بیرنەکردنی باوو باپیرانمانە، کە ئێستا لیزگی ڕووناکیمان پێ دەبەخشن و دەممان هەر لە کانیاوی بیرو وشەکانیاندایە، ئەم پرۆسەیە بەستنەوەی جەمسەرە پیرۆزەکانی رابردوو ئێستایە لە چوارچێوەیەکی شارستانیانەی تێرو تەسەلدا. ئەو ئەرکەی کە لەم سیمینارەدا بەمن سپێردراوە چاوخشانێکی خێرایە بەبەرهەمەکانی شێخی خاڵدا، دیارە ئەم کارە بەم پەلەیە باش نارسکێ و دەشێت بەندە وەك ڕەوتەنیەك بەخێرایی بەوێستگەکانی بیرو هەڵوێستی خاڵدا تێپەڕی، کەواتە ئەرکەکە فرەیەو کاتیشم هێندە بەدەستەوە نیە، شێخ محەمەدی خاڵ نووسەرو زاناو بیریارێکی ناسراوە لە سەرانسەری کوردستانی گەورەدا. بەرهەمە هەمە ڕەنگەکانی بەزمانی کوردی و عەرەبی لە بواری زمانەوانی و وێژەو ئاین و کۆمەڵایەتی و مێژوو کەلەپووری نەتەوایەتیدا باشترین بەڵگەن بۆ گەورەیی و شارەزایی و دڵسۆزی نووسەر لە خزمەتی مەسەلەی نەتەوایەتیماندا، وە لەم ڕێگا پیرۆزەدا بەقەڵەمە بە بڕشتەکەی توانیوێتی خزمەتێکی گەورەی میللەتی کورد بکات و گەلێ کەلەبەری بەرچاو لە کتێبخانەی کوردیدا پڕبکاتەوە.

کتێبە لە چاپ دراوەکانی شێخی خاڵ بریتین لەم بەرهەمە جۆربەجۆرانە:

1- فەرهەنگی خاڵ (بەرگی یەکەم) ساڵی 1960 (366لاپەڕەیە)

2- فەرهەنگی خاڵ (بەرگی دووەم) ساڵی 1964 (348لاپەڕەیە)

3- فەرهەنگی خاڵ (بەرگی سێیەم) ساڵی 1976 (496لاپەڕەیە)

4- ناڵەی دەروون (بەرگی یەکەم) ساڵی 1984 (238لاپەڕەیە)

5- ناڵەی دەروون (جزئی دووەم) ساڵی 1985 (220لاپەڕەیە)

6- مفتی زەهاوی. ساڵی 1953 (132لاپەڕەیە)

7- پەندی پێشینان. چاپی یەکەم ساڵی 1957 (1311) پەندە (189لاپەڕەیە)

8- پەندی پێشینان. چاپی دووەم ساڵی 1971 (3893پەندە) (588لاپەڕەیە)

□ ڕەئوف عوسمان

9-پەندی پیشینان. چاپی سێیەم سالی 2000 (4513پەندە) (588لاپەرەیە)

10-ملا محمدی خاکی. سالی 1978. (63لاپەرەیە)

11-پیشگر و پاشگر. سالی 1974. (24لاپەرەیە)

12-بابا تاهیری هەمەدانی مەشهور بە عوریان. سالی 1977 (35لاپەرەیە)

13-ریزمانی کوردی. سالی 1960. (135لاپەرەیە)

14-پەروەردەی ئاینی. سالی 1975 (270لاپەرەیە)

15-ئاین و رەوشت و جوانکردن. سالی 1949 (70لاپەرەیە)

16-مولودنامەی نەو ئەسەر. چاپی یەکەم/1937 (43لاپەرەیە)

17-مەولودنامەی نەوئەسەر. چاپی دووەم/1972 (32لاپەرەیە)

18-فەلسەفەی ئاینی ئیسلام. سالی 1938 (61لاپەرەیە)

19-تەفسیری سوورەی فاتیحە. سالی 1932 (83لاپەرەیە)

20-تەفسیری سورەتی فاتیحە. چاپی دووەم. سالی 1955 (34لاپەرەیە)

21-سۆزی مینبەر. سالی 1997. (70لاپەرەیە)

22-تەفسیری خاڵ. جزمی یەکەم/1969 (214لاپەرەیە)

23-تە فسیری خاڵ. جزمی دووەم/1972 (198لاپەرەیە)

24-تەفسیری خاڵ. جزمی سییەم/1979 (223لاپەرەیە)

25-تەفسیری خاڵ. جزمی چوارەم/1984 (165لاپەرەیە)

26-تەفسیری خاڵ. تبارك/1986 (297لاپەرەیە)

27-تەفسیری خاڵ. جزمی بیست و حەوتەم/1990 (270 لاپەرەیە)

28-تەفسیری خاڵ. جزمی بیست و هەشتەم/1981 (137لاپەرەیە)

**کتێبە عەرەبییەکانی**

1-البتیوشی/ 1975 (300لاپەرەیە)

2-تأریخ الأمارة الآفراسیابیة أو حلقة مفقودة من تأریخ البصرة/ 1961 (48لاپەرەیە) لەسالی 1987دا وسامی (المؤرخ العربي) لەسەر وەرگرت.

3-مقدمة في المؤنثات السماعیة/ 1967 (59لاپەرەیە)

4-الشیخ معروف النودهي البرزنجي/ 1961 (225لاپەرەیە)

5-کنز اللسن/ 1980 (21لاپەرەیە)

ئەمانە جگە لە چەند کتێبیکی تر کە چاوەروانی چاپکردنن وەك شیخ رەزای تالەبانی و نالەی دەروون بەرگی سێیەم.

ئەمە و جگە لە سەدان وتاری جۆربەجۆر لەگۆڤارەکانی گەلاویژ و هیوا و سلیمانی و شەفەق و رۆژی نوێ و پەروەردە و زانست و بەیان و رۆشنبیری و گۆڤاری کۆری زانیاری کورد و رۆژنامەکانی تأخی و هاوکاری و ژیندا، بلاوی کردۆتەوە.

شیخی خاڵ هەر لەمندالیەوە چاوە گەشەکانی بەدنیای چەوسانەوەی نەتەوایەتی و شکستی گەورە هەلهیناوەتەوە و بەو ئاگرە هەلقرچاوە. لە نزیکەوە و بەبەرچاویەوە شۆرشەکانی شیخ مەحمود بەئاگر و ئاسن دامرکینراوەتەوە، لە شەشی رەشی ئەیلولدا سلیمانی لە خوینی گەشی جوامیرەکانیا شەلاڵ کراو راپەرینەکانی بارزان سوتماك و گرپرژین کران. گۆڤاری کوردستان و قازی محمد پەتی زولم و رەگەزپەرستی کرایە ملیان، چوار ئەفسەرەکە وەك مەسیح لە خاچدران. پەیمانە شوومەکانی سەعد ئاباد و سەنتۆ کوردستانیان هیندەی تر هەناسە برکرد. دیارە شیخی خاڵ لە نیوان ئەم چەرە دووکەڵ و میژووە سوتماکەدا هەلویستی میللەت و مەردایەتی دەگریت و پەنا دەباتە بەرقەلەم و روناکبیری و زانستی هاوچەرخ. شیخی خاڵ زوو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە رزگاری مرۆڤی کورد دەبیت لە ئازادی و پاکژبونەوەی میشکەوە لە هەموو بیریکی پواوو کۆنەخواز دەست پێ بکات، ناکریت فۆرمەلە بوونی بەرهەمەکانی شیخی خاڵ لەو هەلو مەرج و قۆناخە جۆربەجۆرانە دابرکریت، ئەگەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا جۆرە ریسانسیکی روناکبیری کوردی فرە لایەن هەبووبیت، دەشیت پیرەمیرد و تۆفیق وەهبی و شیخی خاڵ و ئەمین زەکی و عەلائەدین سەجادی کاری گەورەیان بۆ کردبێ و کۆلەکەیەکی قەف ئەستووری ئەو دیارە ریسانسیە بووبن. لەو دەورانەدا شیخی خاڵ پەیوەندییەکی روناکبیری و فەرهەنگی گەورەی هەبووە بە جولانەوەی روناکبیری و ئایینی عەرەبەوە. لەو سەرو بەندە میژوویی و روناکبیریەدا دوو ریچکەی دیار و جیاواز هەبووە لە ولاتە عەرەبەکاندا، یەکیکیان ریچکەی بوژاندنەوە و بە بالابرینی کەلەپور و زمان و کەسایەتیە ئەدەبی و میژووییەکانی عەرەب، واتە ریبازی نەتەوەیی، ریچکەیەکی تر کە ئەویش پیشخستنی نەتەوەی عەرەبە لە ریگای ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە و لە جمالەدینی ئەفغانی و محمد عەبدە و سید قتب و رەشید رەزا خۆی دەنوینێ. شیخی خاڵ هەردوو بوارەکەی گرتووە و پەیرەوی رەگەز و شیوازەکانی کردووە، بەلام بۆچی و بۆکێ؟ دیارە بەتەنیا و تەنیا بۆ بەرژەوەندی و خۆشبەختی مرۆڤی کورد. ئەو حەوت جزمەی تەفسیری خاڵ، کە گەلیکی بەش بەش بۆ یەکەمین جار لە گۆڤاری گەلاویژدا بلاوکردۆتەوە، بەلگەی دەسەلاتیکی گەورەی شیخی خالە بەسەر ئەو بابەتەدا و بەروونی دیارە کە کاریگەریتی محمد عەبدە و (في ضلال القرآن)ی سید قوتب رەنگی داوەتەوە. شیخی خاڵ لەو تەفسیرانەدا هەولی داوە قورئانی پیرۆز دوورخاتەوە لە ئیسرائیلیات و بیرورا دواکەوتووەکان و لەسەر بنەما زانیاری و پیشکەوتوەکان راڤەی کات، هەمیشە هەولی تەئویلی لۆژیکی و بابەتیانەی قورئانی دەدا، وە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی دەبەستەوە بەخزمەتی گەل و نیشتمانەوە ئەوەتانێ دەفەرموویت: (ئاشکرایە لە هەموو کەسی کەوە کە قورئان بناغەی ئاینیکی جیهانی و شارستانیەتیکی زۆر گەورەیە و مایەی شۆرشیکی ژیری و بیر و زانین و زانیاریەوە ریگای میژووی ئادەمی گۆریوە). با ئەوەشم لەیاد نەچیت کە یەکیك لە ئیعجازەکانی قورئانی پیرۆز بەدانپیانانی زانا گەورە ئیسلامیەکان، شیواز و دارشتنە بەهیز و ئەفسووناویەکەیەتی و

جزمی سێهەم

# فەرهەنگی خاڵ

نوسراوی

شێخ

محمدی خاڵ

١٩٧٦

---

# تەفسیری خاڵ

بەقەڵەمی

شێخ

محمدی خاڵ

ئەندامی مجمعی علمي عراقي

**جزمی یەک**

**چاپی یەکەم**

چاپخانەی ( أسعد ) ـ بەغدا

١٣٨٩ی ك ـ ١٩٦٩ی ز

بە یارمەتیی وزارتی کاروباری شمال لەچاپدرا

---

کۆماری عیراق

وەزارەتی پەروەردە

# پەروەردەی ئایینی

بۆپۆلی شەشەمی

زانینیو ویژەیی

١٩٧٥

---

# تفسیری سورەی فاتحە

بەقەڵەمی

شێخ محمدی خاڵ

١٣٧٥ھ ـ ١٩٥٥م

چاپخانەی معارف ـ بەغدا

نرخی « ٥٠ » فلسە

ستەمە وەرگێڕانی حەرفی هەرگیز مەبەست بپێکێ، بەڵام وەرگێڕانە مەزن و تۆکمەکەی خاڵ لە ئاستێکی دلۆڤانی ئەوتۆدایە کە گەیشتۆتە چڵەپۆپە و مەگەر ستاتیکای زمانی کوردی هەر لەو نێوانەوە ئەو نمایشە هونەرمەندانەیە بکرێت. دیارە ئەم تاقیکردنەوە دەوڵەمەندەی خاڵ جارێکی دی ئەوە دەسەلمێنێتەوە کە زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە دەوڵەمەندەکانی خۆرهەڵات و ئەمەش بەڵگەی رەسەنایەتی نەتەوەی کوردە. حەز دەکەم ئەوەشتان پێ بڵێم کە لەسەر دەستی خاڵدا بۆ یەکەمین جار دەیان زاراوەی ئایینی بەزمانی کوردی هاتە ئاراوە و بەکاریش دێنرێ، ئەمە جگە لەوەی کە لەوسەروبەندانەدا رای وا هەبوو کە گوایا زمانی کوردی لە ئاست بە ڕاڤەکردنی قورئاندانییە و نابێت دەستی بۆ ببرێت، دیارە سەرامەدێتی خاڵ لەم بوارەدا خۆی لەخۆیدا ئازایەتی و کەشفێکی نوێیە. نەك هەر ئەمەش بەڵکو هەوڵی داوە لە نێوان راڤەی ئایەتەکانەوە دژی زوڵم و زۆر و چەوسانەوە بووەستێتەوە و مرۆڤی کورد هاندات بۆ خۆراپسکان و قبوڵ نەکردنی ئەمری واقیع. بۆیە فەرمویەتی کوردایەتی خواپەرستیە. بەڕێزینە با بزانین شێخی خاڵ بەر لە (32)ساڵ بە بۆنەی سەری ساڵی تازەوە چ جۆرە خیتابێکی بۆ مرۆڤی کورد خوێندۆتەوە: (خوایە شۆڕش هەڵگیرسان وەك ئاگر هەڵگیرسان ئاسانە، بەڵام هەڵسوڕاندنی لە قازانجی گشتی و سودی کۆمەڵدا گرانە. خوایە تاکەی ئەم برایانە لەگەڵ یەکتریدا ناپاکی ئەکەن و هەمیشە بە خوێنی سەری یەکتر تینوون؟ خوایە تا کەی ئەم برایانە لەگەڵ یەکتریدا دڵ کرمێ دەبن؟ خوایە تاکەی ئەم برایانە لە جیاتی ئەوەی کە یەکتری زەبوونکەن ئەگەر یارمەتی یەکتر بدەن باشتر نییە؟) ئەگەر کەسانی دی تەنیا هەستی نەتەوایەتی ئاگری شۆڕشی لە دڵدا کردبنەوە، دیارە شێخی خاڵ هەستی پاکی ئاینی ئیسلام و لایەنە نەتەوایەتیەکەشی، واتە دووجار رق و تۆڵە و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنی پیرۆزکردوە.

تەفسیرەکانی خاڵ جگە لە ناوەڕۆك لە ڕووی داڕشتنیشەوە گەورەترین خزمەتیان بە زمانی کوردی کردوە، لە نووسینی ئەو دەورانەدا وشەی فارسی و عەرەبی فرە بەکاردەبرا و داڕشتنی کوردی هێشتا لە خەم نەڕەخسی بوو. بەڵام شێخی خاڵ یەکەمین کەسیك بوو کە بەو زمانە کوردی‌یە پاراوو بیگەرد و شیرینە قورئان لیك بداتەوە و چیژی رەوانبیژی کوردی ببەخشیتە زمانەکەمان. با ئەوەش نەبویرم کە لە پەنای ئەم تەفسیرانەدا خاڵ بەرگری لە ئافرەت و مافەکانی کردوە و جاری خویندن و زانست وەرگرتن و چوونە خویندنگا و زانکۆی بۆ داون و لە خیزانە جوامیرەکەی خۆیدا پراکتیکی کردوە. ئەمە لە رۆژگاریکدا کە هەندیك بە گوناحی دەزانێ کە تەنانەت کوریش بخاتە خویندنگا و دەبوو هەر لە مزگەوت بخویندرایە، با گوێ رادیرین بزانین بەر لە نیو سەدە چی دەفەرمویت: (کەوابوو خویندەواری دایکەکان واتە کچانی ئەمرۆو دایکی پاشەرۆژ لە هەموو گەلیکدا مایەی پیشکەوتنی گەلە، وە نەخویندەواریشیان مایەی بە قوراچوونە خوارەوەی هەموویانە).

خاڵ لە کتیبی (سۆزی مینبەردا) دیسانەوە هەولی داوە لە ریگای ئاینی ئیسلام و وتاری رۆژانی جومعەدا گیانی بویرانەی دژ بە زولم و زۆر ببزوینێ، کیشە کۆمەڵایەتیکان چارەسەرکات و دانبە نەریتە پواوو پووچەکاندا نەنیت و پیگەی کۆمەلگای مەدەنی بنج بەست کات و پرسیارە بەجێ و گرنگەکانی بوروژینێ، سەیری ئەم بابەتانە بکەن کە لە وتاری مزگەوتدا خویندونیەتەوە، (کردوکۆشی، دەردی درۆ، توورەیی و دووزبانی، تەشاؤم، دەستەبەری کۆمەڵایەتی...)

سەرنج بدەن لە حوجرەی مزگەوتیکی شاری سلیمانیەوە بەر لە نیو سەدە میزەر بە سەریك بە قەلەمە بە برشتەکەی چرای بیری نەتەوەییمان دادەگیرسینێ و لەدەرگای میژووی هاوچەرخمان دەدا، زەنگی زوڵالی ئازادی و رزگاریو باڵادەستی زانست و عەقڵ و بیری نەتەوەیی رادەژەنێ دژی تەوژمی باو دەوەستیتەوە و بانگهیشتی رابوون هەلئەدا، لە قۆزاخەی شاریکی بچکۆلەی وەك سلیمانیەوە هەنگاوی گەورە دەنێ نامەی بیرورا لەگەڵ رابەرانی رۆشنگەری عەرەبی سەدەی بیستەمدا ئالوگۆر دەکات، تەها حسین و دکتۆر ئەحمەد ئەمین و عەباس عەقاد و شیخ شەلتوتی سەرۆکی زانکۆی ئەزهەر و دکتۆر حسین علی محفوز و تەها باقر و دکتۆر ئەحمەد سووسە و منیر القاضي و گورگیس عوادوکەسانی گەورەی تریش دەبنە هاوریی و پەیامی نەتەوەی کوردیان دەداتێ.

شیخی خاڵ بۆ ناساندنی نووسەرانی کورد بەگەلانی عەرەب چەند کتیبیکی بەزمانی عەرەبی نووسیوەتەوە کە دیارترینیان شیخ مارفی نۆدێ و بەیتووشی و (کنزالسن)ی زانای گەورە و بیر تیژ شیخ ئەحمەد فایزی بەرزنجی بوو. ئەمە جگە لە نامیلکەی باباتاهیری عوریان و مەلا موحەمەدی خاکی و مفتی زەهاوی و نەبینای بلیمەت مەلا حەمدونە. لە شاکارەکەی مەرشیخ مارفی نۆدیدا شیخی خاڵ لە دەرگای دلی رەش و رزیوی رەگەزپەرستە عەرەبەکانی داوە و بەرەنگاریان بۆتەوە، بەزمانیکی عەرەبی پاراو باسی لە جوگرافیای کوردستانی گەورە کردوە، نەك هەر ئەمەش بەلکو باسی لە میژووی کورد و کوردستان و میرنشینەکان کردوە و خۆشەویستی و ئەوینی مرۆڤی کوردی بۆ زانین و شارستانیەت لەو قۆناغەدا دیاریکردووە. دیارە یەکیکی وەك عەبدولسەلام عارف کە ئەو کاتە جیگری سەرۆکی کۆمار عبدوالکریم قاسم بووە، بەمە گەلیك سەغلەت بووە و بەتەلەفۆن داوای لە مەجمەعی عیلمی کردووە کە دەبیت شیخی خاڵ باسی جوگرافیای کوردستان و میژووی کورد لەو کتیبەدا لابەریت، دیارە شیخی خاڵ بەمە قایل نەبووە و پیی داگرتووە. با ئەوەشتان لەیاد نەچیت کە ئەم کتیبە گرنگە کاتیك 22ی ئەیلولی 1961دا بەچاپ گەیشتووە کە میللەتی کورد لەو دەورانەدا تازە بەتازە ئاگری شۆرشی ئەیلولی هەلکردبوو، وە لەژیر هیرشی درندانەی سوپای قاسمدا دەینالاند. واتە

قەڵەمەکەی خاڵ لەو دەورانەدا جوامێرترین پێشمەرگەی عەقڵ و هۆش بووە لە جەرگەی بەغدا و وڵاتە عەرەبەکاندا، نابێت ئەوەش ببوێرم کە خودی کتێبەکە بەم شێوەیە پێشکەش بە مە لیك مەحمودی شۆڕشگێڕ کراوە: "الى تلك الروح الطيبة التي مازالت حتى النفس الأخير تجاهد وتكافح بأيمان واخلاص". دیارە ئەمەشیان ئامبازبوونەوەیەکی بوێرانەی تری ڕژێم بووە، شێخی خاڵ لە هەمان کتێبدا تیشك دەخاتە سەر قەسیدەیەکی دورو درێژی شێخ مارفی نۆدێ کە باس لەگەندەڵی ئیداری بابانەکان و خۆخۆری و گیرفان پڕکردن و خزم خزمێنەیان دەکات و لە هەمان کاتیشدا ستایشی سوڵتان دەکات بەڵام شێخی خاڵ دەڵێت نە ئەبوو لە بەرامبەر ئەم حاڵە نێگەتیڤیەدا شێخ مارف رقی هەستێ و ستایشی سوڵتان بکات. دیارە ئەم هەڵوێستە رەخنەگرانەی خاڵ بەڵگەی تێ گەیشتنی ود و ژیرانەیە لە ئاستەنگیەکانی فەرمان رەوایەتی ئەو سەردەمەی کورد. لە کتێبی بەیتووشیدا بەجۆرێك ئەم زانایەی نرخاندووە کە بردوویەتیە ئاستی گەورە زانایانی عەرەبەوە و بۆتە باشترین سەرچاوە بۆ خوێندکارانی خوێندنی باڵا، چونکە لە نێوان بەیتووشی و تەنانەت موفتی زەهاویش کە کەسایەتیەکی زانست و ناوداری کوردە، دەرگای واڵاکردووە بۆ نمایشی باری روناکبیری لە کوردستاندا و تیشك خستنە سەر زانا کوردە بەناوبانگەکان و شوێنەوارەکانیان و هەلومەرجە گشتی و تایبەتێکانیش. حەز دەکەم ئەوەش بڵێم کە ئەگەر ئەو نە بوایە کەسی ئەم سەردەمە نەیدەتوانی شاکارەکەی زانای گەورە ئەحمەد فایز بەرزنجی لێك بداتەوە کە بە شەش زمانی جیاجیا دەخوێنرێتەوە.

لە هەردوو بەرگەکەی نالەی دەروندا خوێنەر هەست بە مەوسوعیەتی خاڵ دەکات و دەزانێ کە ئەو زانایە چۆن و بە چ چەکی عەقڵێك داوای کۆمەڵگای مەدەنی و ڕۆشنگەری و باڵادەستی یاسا و عەقڵ و بیر و داد دەکات.

بەڕێزینە حەز دەکەم بابەتەکەم بەم چەند گلەییە حەق و ڕەقە کۆتایی پێ بێنم. تا ئێستا لەم کوردستانە ئازادەدا خوێندنگایەك بەناوی شێخ محەمەدی خاڵەوە ناونەنراوە. ئەمە لە کاتێکدا کە لە جەنتای هەمو خوێندکارێکدا بەرهەم و مەنهەجی خوێندنی خاڵی تێدایە، هەزاران ئەفسووس! لەمەش سەیر و تراژیدی تر ئەوەیە کە تا ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هەموو کابینە جیاجیاکانیەوە بیری لە چارەسەری کتێبخانە گەورە و پڕ ئەهەمیەتەکەی خاڵی نەکردۆتەوە. ئەم کتێبخانەیە ژمارەیەکی زۆر دەستنووسی دەگمەن و بەنرخی تێدایە، جگە لە هەزاران کتێبی گرنگ و بایەخدار کە تۆزی نیشتۆتە سەر و بێ ناز کەوتووە، دەبوو دەزگا و هەیئەتی تایبەتی تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی بۆ دانرایە و دەستنوسەکان فۆتۆکۆپی و بە مایکرۆ فیلم وێنەی لێ بگیرایە و لە فەوتان رزگارکرایە و واڵاش بکرایەتەوە لە بەردەم توێژەرەوە و خوێندکارەکانی خوێندنی باڵادا، چونکە ئەم گەنجینەیە موڵکی میللەتی کوردە و حەیف و مەخابنیشە کە بەم شێوە تراژیدی و کۆمیدیە لە بیربکرێت! هەروەها داوا لە ڕۆڤار دەکەم کە ژمارەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان بکەن لە داهاتوودا.

**سەرچاوە**

گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (29)ی حوزەیرانی (2002).


من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

مخطوطات مكتبة الشيخ محمد الخال في السليمانية

العضو العامل : الشيخ محمد الخال

مستلة من المجلد الثالث ، العدد الاول
من « مجلة المجمع العلمي الكردي »

مطبعة المجمع العلمي الكردي
بغداد – ١٩٧٥


كنز اللسن

المكنوز فيه ستة ألسن واثنا عشر فناً

تأليف

العلامة السيد أحمد فائز البرزنجي

قام بتصحيحه وضبطه والتعليقات عليه وكتابة المقدمة

الشيخ محمد الخال

مطبوعات المجمع العلمي العراقي (الهيئة الكردية)

١٤٠٠هـ - ١٩٨٠م


ساعدت وزارة المعارف على نشره

البيتوشي

تأليف

محمد الخال

مفتي السليمانية

مطبعة المعارف – بغداد
١٣٧٧ هـ — ١٩٥٨ م

الثمن ٥٠٠ فلس

# فەرهەنگی خاڵ

خاڵ


1935–1933

خوایە! نازانم بە چ زبانێك سوپاست بكەم، وە بەچ ئاڵا "قەڵەم" یەك ستایشت بنووسم، تۆ ئەو خوایەیت كە ئادەمییت لە ناو هەموو گیان لەبەرانا بەرز كردۆتەوە، زانا و دانات كردوون، ژیریی و بییرت داونەتێ، وە كردووتن بە جێ نشیینی خۆت لەسەر زەویی، بەپێی دەستوور و باوی پەرەسەندن و بلاوبوونەوە هەموویانت تییرە تییرە و كۆمەڵ كۆمەڵ كردوون، وەهەر تییرە و كۆمەڵەیەك بەپێی ناوچەی خۆی زبانێكت داونەتێ، تا مەبەستی خۆیانی پێ بەجێ بێنن، وە لەگەڵ یەكتریی قسەی پێ بكەن، وە خستووتەتە دڵی هێندێ لە خوێندەوارانی بەرز و پێشەوایانیانەوە كە ووتە كۆبكەنەوە و فەرهەنگ بنووسن، وە بە یادگار بۆ دوای خۆیانی بەجێ بهێڵن، سا بەڵكو هەموو لایەكیان لەیەك بگەن، وە لەیەكتریی نزیك بكەونەوە، وە بەئاشتیی دانیشن، وە لە پاشەڕۆژدا دەست بكەنە ملی یەك بە برایەتی. بێ گومانم كە دوو شت گەورەترین شۆڕشی هەڵ گیرسان لە جیهانا، وە لە ئادەمیی جیا كردەوە لە گیان لەبەرانی تر، وە لەناو هەمویانا ئەمی لەسەر تەختی پاشایی دانا لەم جیهانەدا، یەكەم دەستی، دەوهەم زبانی، كە دەستی بەرەڵاكرد بەم ڕەنگە بەرزی كردەوە لەزەوی لەكاتی ڕۆینا سەد هەزاران هەزار شتی سەیری پێ دروست كرد، وەگەورەترین كەلەپووری بەجێ هێشت لەسەر زەوی، كە زبانی بەرەڵاكرد بەم ڕەنگە دەستی كرد بە قسەكردن، توانی هەرچی بەدڵیابێ بیڵێ وە هەموو كەسێك لەگەڵ هەموو كەسێكا قسەبكەن و تێ بگەن، وە یارمەتی بییری یەكتریی بدەن تا ئادەمیی گەیشتە ئەم پایەبەرزە لەزانین و ژیریی و بییر و وێژەدا كە هەرچی ئیمڕۆ ئەی بینیین لەدیمەنی شارستانی لەزانیین و لە كردار هەمووی بەری كردەوەی دەست و زبانێتی.

بەڕاستی دۆزینەوەی پییت و ووتە و ووتار و قسەكردن شتێكی زۆر زۆر سەیرە، ئەگەر ڕاستت ئەوێ لەدۆزیینەوەی ئەتۆم گەلێ گەلێ ووردتر و هونەرترە، بەلام چونكە لە منالیەوە فێری بووین بۆیە زۆر لێی سەرسام نابین ئنجا لەبەر ئەمە ئادەمی لەزۆر كۆنەوە خەرییكی دانانی ووتە و كۆكردنەوەیەتی. لە هەموو كەسێكەوە ئاشكرا و نمایانە كە زمان پایەی هەرە گەورە و بەهێزە لە كۆشكی كۆمەڵایەتیدا، وە ڕوشتەی هەرە قایم و بەتیینە بۆ یەكخستنی كۆمەڵەو گەل لە ڕۆژهەڵاتیە وە تا ڕۆژئاوای، بەڵكو زبان گیانی گەلە كە زبان بوو گەل هەیە، كە نەشبوو گەل نیە.

هەروەها ئاشكرایە كە سەرمایەی زمان خەرمانی ووتەیە، وە گەنجینەكەشی فەرهەنگی ووشەیە، هەر بەهۆی فەرهەنگەوەیە كە مەبەست لەووتە دەرئەكەوێ وە هەموو ووتارێك نمایان ئەبێ، كەوابوو نووسیینی فەرهەنگ بۆ پاسی زمان لە هەموو شت پێویست ترە بۆ مانەوەی گەلان، هەر گەلێ'ك زمان و فەرهەنگی نەبێ لەگەڵ گەلانا ناژمێررێ و ناناسرێ، بەڵكو ئەكرێ بە بەردەباز و پێشێل لە ژێر پێی ئەو گەلانەی كە بۆ كوێستانی ژیان ئەچن، ئالەوێ پێڵگەدا پان و پلیش ئەكرێنەوە، وە لەگەڵ خاكا یەكسان ئەكرێن.

بەلام كە زمان و فەرهەنگی بوو بادیلییش بێ هەر گەلە، وە بەگەل ئەناسرێ وە ڕۆژێك ئەبێ كە لەگەڵ گەلانی خواپێداوا ڕووەو كوێستانی ژیان بڕواو سەركەوێ، وە لەپێشكەوتن و بەرزبوونەوەدا بێ، تا ئەگاتە لوتكەی هەرەبەرزی ژیان، وەبەسەر چڵەپۆپەی كامەرانیەوە وەك بلبلی هەزار داستان بخوێنێ و بچرییكێنێ. كەوابو ئاگاداریی كردنی زمان بە نووسینی فەرهەنگ و كۆكردنەوەی ووتە لە ئاگاداریی كردنی گیان پێویست ترە بۆ

مانەوەی گەلان، چونکی بەنەمانی هەزاران گیان گەل نامریَ، بەلاّم بەنەمانی زمان ریشتەی کۆمەلاّیەتی ئەپچڕیَ وە شیرازەی گەل تیَك ئەچیَ تا هەموو پەرەوازە ئەبن و لەیەك ئەبڕیَن وە زۆردار قووتیان ئەدەن و لەناویان ئەبەن.

ئەگەر بەچاویَکی ووردبوونەوە تەماشای سەرگوروشتەو میَژووی گەلانی رابووردوو بکەین، تیَ ئەگەین کە لەمەو پیَش زۆر گەلی گەورە بوون کە لە خویَندەواریی و تیَگەیشتن و پیَگەیشتن و تیَکۆشین و پیَشکەوتنا پایەیەکی بەرز و جیَگایەکی بلّندیان بووە، وە لەسەر رووپەڕەی میَژوو زۆر نیشانەی مەردانە و پیاوانەیان بەجیَ هیَشتووە، بەلاّم چونکە وەیشومەی ڕۆژگار، وە گەردشی چەرخی کەچ رەفتار، زمانەکەی لەناو بردوون، خۆشیان لەناوچوون، سا مەگەر لەکون و قوژبنی میَژوودا ناویَکیان مابیَتەوە.

کەوابوو مانەوەی زمان مایەی مانەوەی گەلە، هەر گەلیَك تا هەرچەندە دووچاری خەم و تەم و خەفەت و دەردی سەریی ببیَ، وە تالّییو سویَریی ڕۆژگار بچەژیَ، وە تەنگانە و چەلّەمە کەلّەمەی بکا، ئەو گەلە هەر ئەژی و ئەمیَنیَ تاوەکو ئاگاداریی زمانەکەیان بکەن، وە نەیەلّن لەناوبچیَ.

کەواتە زمان بۆ ئاگاداریی گەلان لە هەموو قەلاّیەکی ئاسنین و قوللەیەکی سەختی بەهیَزی مسیین باشتر و چاکترە، چونکە قەلاّ ئەگیریَ و قوللە ئەڕوخیَنریَ بەلاّم زمان هیچی لیَ ناکریَ.

هەزاران ئافرین بۆ ئەو زانایەی کە ووتویەتی: گەلی دیلی خاوەن فەرهەنگ و زمان وەك بەندییەك وایە کە کلیلی دەرگای بەندیخانەکەی لەگیرفانا بیَ، هەر حەلیَك بیەویَ رزگار، وە لەدیلی سەرفراز ببیَ، بەکلیلی زمانەکەی دەرگای بەندیخانەی دیلییەکەی ئەکاتەوە، وە بەیداخی ئازادیی و سەربەخۆیی هەلّ ئەدا بەلاّم گەلی دیلی بیَ فەرهەنگ و زمان وەك بەندییەك وایە کە کلیلی دەرگای بەندیخانەکەی لە گیرفانی دوژمنەکەیابیَ، ناچار ئەبیَ دەستەئەژنۆ دانیشیَ تا ئەتویَتەوە و نامیَنیَ، وە هەموو کەلەپوور و دارایییەکەی داگیر ئەکریَ، وە مالّی ئەچیَتە سەربەشی مالاّن، وە بە ئیَجگاریی چرای ئەکوژیَتەوە.

کەوابو کۆکردنەوەی ووتەو نووسینی فەرهەنگ بۆ کۆمەلّە و گەل لە هەموو شت پیَویست تر و بەنرخترە.

***

کەس نیە لە جیهانا بتوانیَ گشت ووتەی زمانی خۆی بزانیَ، وە لە میَشك و دلّیا جیَگای ببیَتەوە، چونکە ئەمە هەر شایستەی خوایە، جا لەبەر ئەمە هەموو زمانیَك ئەگەر لە چوارچیَوەی فەرهەنگ نەگیریَ وەیشومەی ڕۆژگار شەن و کەوی تیا ئەکا و بەبای ئەدا، وە کۆگای ووتەکانی بەرە بەرە کەم ئەکاتەوە تاوای لیَ دیَ کە نەتوانیَ بەسەر مایەکەی خۆی بژی و مەبەست بەجیَبیَنیَ.

لەبەر ئەمانە زانا بەرزەکان، وە تیَگەیشتوانی هەموو گەلیَك لەزۆر کۆنەوە خەریکی نووسیینی فەرهەنگ و کۆکردنەوەی ووتەی گەلەکەیان بوون، تا ژمارەی فەرهەنگیان گەیشتە ژمارەی زمانانی سەرزەوی، نەخوازەلاّ فەرهەنگی زمانە زیندووەکان کە ژمارەیان گەیشتۆتە هەزار و پیَنج سەد (1) وە ژمارەی ووتەی هیَندیَك لەو فەرهەنگانەش لەسەدهەزار تیَ پەڕییوە.

کۆنترین فەرهەنگیَك کە نوسراوە فەرهەنگی (کالیماکی غەراماتیقی إغریقی)یە کە سیَ سەد سالّ لە پیَش میلادا نووسیویەتی، وە ناوی ناوە (زەخیرە)، لە پاش ئەم فەرهەنگە ئنجا بەرە بەرە فەرهەنگی تر نوسراوە بە یۆنانی ئینجا بە عەرەبی ئنجا بە زمانەکانی تر کە یەکیَکیان زمانی کوردییە.

کۆنترین فەرهەنگیَکی کوردیی کە نوسرابیَ –بەپیَی زانینی من– فەرهەنگی (ئەحمەدی خانی)یە، کە لە سالّی 1094 ه بە شیعر نووسیویەتی لە عەرەبییەوە بۆ کوردیی، وە ناوی ناوە (نەوبەهار) کە لە داویَنی فەرهەنگی (الهدية الحميدية، في اللغة الكردية) لە چاپدراوە.

نەوبەهار نۆ (چەکامە) "قصیدە"یە، هەر چەکامەی لە وەزنیَك. وا بۆ نمونە سیَ شیعری ئەنوسیین هەر یەکەی لە چەکامەیەك:–

**(رجل) پیَ و(ركبه) ئەژنۆ (بطن)سك**

**(صدر)سنگ و (جيد) ئەستۆ (عين) چاڤ**

**(بيدا)، (فلاة)و (سبب)، (فيفاو) و(بدو) دەشتن**

**(ينبوع) و(عين) کانی (جب)و (قليب) بییرە**

**(اكحل) مرۆڤی چاڤ بەکل (أشهل) مرۆڤی چاڤ بەلەك**

**(أشقر) مرۆڤی چاڤ هشین، رەنگی گەنم گون (أسمر)ە**

لەپاشا ئنجا شیَخ مارفی نۆدیَیی (أحمدیی) نووسیوە بە شیعر لە سالّی (1210ه) لەسەر شیَوەی (نەوبەهار) وە لە عەرەبییەوە بۆ کوردیی، تا ئیَستا دووجار لەچاپ دراوە، جاریَکیان لە سلیَمانی لە چاپخانەی (ژیان) لە سالّی (1354ه)– (1936م) جاری دووهەمییش لە (بغداد) هەر لەو سالّەدا.

(احمدی) دوو بابە (1) بابی أسماء (2) بابی أفعال، بابی أسماء سیَ فەسلّە هەر فەسلّەی لەسەر وەزنیَکە، فەسلّی یەکەمی وەك:–

**(رأس)سەرە (عين)چاوە**

**(بدن) قالّب (إسم)ناوە**

فەسلّی دووهەم وەك:–

**(سور) وارشە (حائط) حەسار**

**(حديث) سخن (مسمار) بزمار**

فەسلّی سیَهەم وەك:–

**(أين)لەکویَ (من)کیَیە (أيان)کەی**

**(إن) ئەگەر (ما)چی (متی) کەی (سم) ژار**

بابی أفعال هەر یەك وەزنە وەك:–

**(جلس) دانیشت (نهض) هەستا**

**(قعد)دانیشت (وقف)وەستا**

لەدوای أحمدیی ئنجا فەرهەنگی جنرالّ "ئۆغۆستۆیابا" یەکە قونسولّیَکی رووس بووە لە شاری (أرضرۆم) وە فەرهەنگەکەی

(8428) ووتەیە وە لە ساڵی (1879م) لەلایەن (فەردیناند جوستی)یەوە لەچاپدراوە لەشاری (پترسپورغ) کە ئێستا پێ ی ئەڵێن (لەنینغراد)، لەساڵی "1943م" لە چەمچەماڵ ئەم فەرهەنگەم چاوپێ کەوت لای "زین العابدینی"ی کوڕی (ملافانی).

لەدوای ئەم فەرهەنگە ئنجا (یوسف ضیا پاشای خالدی) فەرهەنگێکی نووسیوە لە کوردیی‌یەوە بۆ عەرەبی لەگەڵ سەرەتایەك لە دەستووری زمانی کوردیی وە ناوی ناوە (الهدیة الحمیدیة، في اللغة الکردیة) وە لە ساڵی "1310"ی ڕۆمی لە ئەستەموڵ لەچاپ دراوە، بەڵام ووتەکانی هەر ووتەی "زازا" وە گەلێکیشی ناوی شاخ و کانی و دێهاتی ئەو ناوچەیەیە، کە ئەمانە لە فەرهەنگی ووتەدا نانوسرێن بەڵام بە ڕاستی فەرهەنگێکی جوان، وەکەلێنێکی زۆر گەورەی پڕ کردۆتەوە بەشی زۆری ووتەی (زازا)م لەم فەرهەنگە وەرگرتوە، ساخوا بەمیهرەبانیی خۆی پاداشی بداتەوە.

لەپاشا ئنجا فەرهەنگی (مێجەر سۆن) دەرچوو- کە حاکمێکی ئینگلیزیی بوو لە شاری سلێمانی لەکوردیی‌یەوە بۆ ئینگلیزی، وە لە ساڵی "1919"م لە (لندن) لەچاپ دراوە.

لەساڵی (1950م) (رابەر) دەرچوو لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردیی.

لەپاش ئەم فەرهەنگانە ئنجا فەرهەنگی (مەردۆخ) دەرچوو لە ساڵی (1375هـ) (1956م) بەڕاستی کۆششێکی گەورە و نوسراوێکی بەنرخە، شتی وا مەگەر هەر بەقەڵەمی زانا و پێشەوایەکی وەك (ئایة اللە‌ی کوردستانی) بنوسرێ، بەڕاستی کارەکەی پەسند و کردەوەکەی جێی سوپاس و ستایشە، بەڵام- داخەکەم چەند نەنگێکی تیایە کە چاوی لێ ناپۆشرێ:-

1-خۆی لەسەرەتای فەرهەنگەکەوە دەستوورێکی تایبەتی داناوە بۆ چۆنێتی نووسینی کوردیی، کەچی خۆی فەرهەنگەکەی بەو دەستورە نەنووسیوە بەڵکو بەپێی دەستووری فارسی نووسیبویەتی، کەسێك فارسی زان نەبێ نازانێ بیخوێنێتەوە.

2-لەبەرئەوەی کە بەپێی دەستووری نووسینی کوردیی نەنووسراوە، ووتەکانیشی بەو جۆرە ڕیز نەکراوە، لەبەر ئەمە ووتەی ئێجگار بەگران تیا ئەدۆزرێتەوە.

3-نییوەی ووتەکانی ووتە نین، سا یا:-

أ-فعلن- کەنابێ بنوسرێن- وەك (بدە، ئاما، ئێژێ، ئەوییني، ئەژیی، ئەدا، ئەدرەوشێ).

ب-یاناوە بۆ یەکێك -کەنابێ بنوسرێ- وەك:- (ئامینە).

ج-یاهەر ناویش نیە وەك:- (ئامە) کە ئەڵێ: کورتەی (ئامان اللە)یە.

د-یا دروست کراوە وەك:- (بەدشەو، بەدصبح).

هـ-یا هەر ووتە نیە وەك: "ئەسپی تەمەڵ، ئەسپی سواریی، ئەسپی تەڵایی، ئەسپی یاڵ چەرمگ، بارانی وورد، بارانی درشت، بارانی ناوەخت، بارانی کەم، بەن دەرگای جەواڵ، بەن دەرگای خییگە، باقلەی کوڵیاگ، بم خە بمرە، بمزانیایە، بم شێلە، بم گرە، بم لاوێنە، بم کەرە زووخاڵ، بمێنە".

و-یا هەر هەڵەیە وەك: (برس) لەبرسێتی و (تاقی) لەتاقی کردنەوەدا کە ئەمانە هەرگیز نەبیستراوون.

4-زۆری ووتەی عەرەبی ناقۆڵایە وەك: "أصلع، إعجاز، اضطراب، إراك، إحجاف، أسد، أوج، استشمام، أصحاب الکهف، ارذل الناس".

5-زۆریشی ووتەی فارسی‌یە، وەك: (پەزیرا، پەزیرایی، پەزیرە، پرخاش).

6-ووتەکانی هەر ووتەی (أردلان)ە زازا و بادینانی تیا نیە، بابان و هەورامی و لوڕی و فەیلیشی مەگەر بەدەگمەن تیابێ.

7-زۆرتر راڤە (شرح)ی ووتەیەکی بەتاقە ووتەیەك کردووە، بەبێ ئەمەی کە درێژەی پێ بدا وە پێت بڵێ کە چۆن بەکار ئەهێنرێ، یا باسی گیایەك، یا گوڵێك یا درەختێك یا یاریی‌یەکت بۆ بکا یا دەنگێکت لەدەنگێکی تر بۆ جیابکاتەوە.

8-زۆرجار راڤەی ووتەیەکت بە وتەیەك بۆ ئەکات کە خۆی ئەو ووتەیەی لە شوێنی خۆیا نەگرتوە، وەك ووتەی (پاماسێ) کە راڤەی ئەکا بە (پاماسە) یا (چوت) کە راڤەی ئەکا بە (چورتکە) کەچی (پاماسە) و (چورتکە) لەفەرهەنگەکەیا ناگرێ.

9-زۆر ووتەی وا هەیە سێ جار نووسیبویەتی وەك: (نۆوەن)، یا دوو جار نووسیبویەتی وەك: (خورجیین، نەدارا، نەزانست، نەزانکار).

10-زۆر ووتەی وای هەیە لە دوو لاوە ئەیگرێ و راڤەی ئەکا، بەڵام لەهەر لایەی بەجۆریك وەك: (نەگۆمە).

لەگەڵ ئەمیشە بەشی زۆری ووتەی ئەردەڵانم لە فەرهەنگی مەردۆخ وەرگرتوە فەرهەنگی (نەوبەهار) و (احمدیی) و (میجەر سۆن) یەکی چەن لاپەرەیەکی بچووك و چەن ووتەیەکی کەمن کە شایستەی ئەوە نیین پێیان بووترێ فەرهەنگی کوردیی، جگە لەوەش کە نەوبەهار و احمدی و (رابەر) لە عەرەبی‌یەوەن بۆ کوردی، واتە فەرهەنگی عەرەبین نەك کوردیی.

فەرهەنگی (ضیا پاشا)ش هەر ووتەی زازایە.

فەرهەنگی (ئۆغۆستۆیابا)ش وەك (عەنقا) وایە دەنگی هەیە و رەنگی نیە جگە لەوە کە ووتەکانیشی هەر ووتەی ناوچەیەکی بچووکە لە کوردستان.

ئینجا کاتیك کەوورد بوومەوە و تێ گەیشتم کە زمانەکەمان هێشتا فەرهەنگیکی وای بۆ نەنوسراوە کەرووی بێ بچێتە ناو فەرهەنگانەوە، وە ئەمە سێ چوار هەزار سالە کورد -کە خاوەنی زمان و نووسیینە- هێشتا ووتەی زمانەکەی خۆی کۆنەکردۆتەوە، وە کەس بەبییریا نەهاتووە کە فەرهەنگیکی تیك رایی بۆ بنووسێ، لەگەڵ ئەمەی کە زمانی کوردی لە زمانە دەولەمەندە زیندووەکانە وە لە ئاهەنگ و شیوە و دەنگا لەگەڵ ناسکترین زمان -کە فەرەنسی‌یە- جیاوازی‌یەکی نیە.

ئینجا هەرچەند بییرم لە دەولەمەندیی زمانی کوردیی و جوانیی ئاهەنگەکەی ئەکردەوە بزە ئەیگرتم، وە هەرچەند بییریشم ئەکەوتەوە

کەوا خەرمانی زمانەکەمان لەدەشتی بێ کەسی وەلەبەر باڕەشی ڕۆژگارا ماوەتەوە بەڕاستە و چەپەدا شەن و کەوی‌تیا ئەکا و بەبای ئەدا هەنسکم هەڵ ئەدا، بەم ڕەنگە چەند ساڵێك لە ناوەندی بزەو هەنسکا مامەوە تاخوا هێنامیە سەر کۆکردنەوەی (ووتە) و نووسینی ئەم (فەرهەنگ)ە.

لەساڵی (1935) وە بە هەموو هێز و تەوانایی خۆمەوە خەریکی کۆکردنەوەی ووتەی کوردییم بە هەموو ئاهەنگ و شێوەکانیەوە وە بەووتەی بابان، و سۆران و، زازاو، بۆتان و، بادینان و، لوڕ و، فەیلی و، لەك و، موکریان و، هەورامی و، ئەردەڵانەوە. وە لەم ڕێیەدا زۆر ڕەنجم داوە و کۆششم کردووە تا ووتەی ڕاست و دروستم کۆکردۆتەوە وە هەزاران ووتەی ناقۆڵام لە بڕبەنگ و هەسان داوە تا ڕاستم کردوونەتەوە.

زۆرجار ووتەم لەدوورەوە بۆ هاتووە بەڵام چونکی بە شێوەی نووسینی کوردی نەنوسراوە دڵنیا نەبووم لێی و تێکەڵی فەرهەنگەکەم نەکردووە تا زانییومە لای ژن یا لادێیی یاڕاوکەر یا جووتیار یا جۆڵا یا دارتاش یا ئاشوەستا یا ناڵبەند یاکاڵاوزیین و کورتان و کەوشدرو دەست ئەکەوێ بەتایبەتی لێم پرسیبونەتەوە تا هیچ گومانێکم نەماوە.

ئەوی لەم فەرهەنگە وورد ئەبێتەوە ئەبێ بزانێ کە تا ئێستا لەم ڕووەوە سەرمەشقێکمان بۆ دانەدراوە تا چاوی لێ بکەین، و فەرهەنگێکی تێکڕاییمان بە زمانی کوردیی بۆ نەنوسراوە تا لاسایی بکەینەوە، وە ووتەکانمان ڕییزنەکراوە و مەبەستیان بۆ دانەنراوە، وە مەبەست دانەوەش لە ووتان بەڕەنگێکی وا کە هەموو ووتەیەك لەیەك جیا بکاتەوە، وە هەموو ووتەیەك ڕاڤەیەکی وای بۆ بنووسرێ کە بە تەواویی هەموو کەسێك لە مەبەستەکەی بگات. زۆر زۆر گرانەوە هەروا بە ئاسانی مەزانە ڕاڤە کردن و مەبەست دانەوە لە ووتەی (بەڵام) یا (تومەز) یا (مەگەر) یا (گونجان) یا (خاڵانە) یا (ئە) یا (بە) یا (ئانە) یا (ئەگینا) یا هەزاران ووتەی تری وا. هەروەك پێویستە بزانێ کە ئاهەنگی زمانی کوردیی و عەرەبی لە یەك جیان، وە فەرهەنگی کوردی نابێ لەسەر شێوە و دەستووری فەرهەنگی عەرەبی بێ، ئنجا ئەگەر ئەم فەرهەنگە باش و پەسەند بوو ئەوا ئاواتی چەند ساڵەی خۆم و گەلەکەم هاتەدیی ئەگینا من درێغ و کۆتاییم نەکردووە وە شتی بێ نەنگیش هەر شایستەی خوایە، لەگەڵ ئەمیشە کە ئەگونجێ چەند جارێکی تر بەڕودوا لەچاپی بدەینەوە، وە هەموو نۆرەیەك گەلێ ووتەی تری بخەینە سەر، وەکەم و کوڕیی وە هەڵەیی‌یەکی ئەگەر ببێ چاکی بکەین.

**( پەیدا بوونی ووتە و زمان )**

ووتە ووشەیەکە کە بۆ مەبەستێك دانرابێ.

ووتار گوفتارێکە کە هەموو کەسێك مەبەستی دڵی خۆی پێ بەجێ دێنێ. پەیدا بوونی ووتە و زمان بەهۆی کۆمەڵایەتی ئادەمییەوە بووە، ئەگەر کۆمەڵایەتی نەبوایە پێویست نە ئەبوون بە تێگەیاندنی یەکتریی لەو مەبەستانەی کە بەدڵیانا هاتوچۆی کردووە، وە ئەگەر پێویستیش بە تێ گەیاندن نەبوونایە قسەکردن نەئەبوو، وە ئەگەر قسەکردنیش نەبوایە ئیمڕۆ ووتەو زمان نەئەبوو کەوابوو هەرچی ووتەی ئادەمی هەیە هەموو زادەی کۆمەڵایەتی‌یە.

زۆر لە زانایانی زمان بەلایانەوە وایە کە ووتان یەکەم جار وەرگیراوە لە دەنگەوە (1)، واتە لەدەنگی گیاندار و باو باران و ئەو شتانەی کە لە کردەوەیەکی ئادەمی زادەوە پەیدا ئەبێ وەك دەنگی لێدان و کوتان و شکاندن و گەلێ شتی تر، ئنجا مەبەستیان لە گێڕانەوەی یەکێك لەو دەنگانە باسی ئەو شتە بووە کە دەنگەکەی لێوە هاتووە یا باسی شتێك بووە کە بەخاوەنی دەنگەکەوە بووە، وە لەگەڵ گێڕانەوەی ئەو دەنگانەدا جووڵانەوەی سەرو دەست و چاوو ئەندامیشیان بەکارهێناوە بۆ پیشاندانی درێژی و پانی و ئەستووریی و قەبارە و چۆنێتی ئەو شتەی کە قسەیان لێ کردووە، لەپاشا بەرە بەرە بەپێی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی ئادەمی و زۆر بوونی پێویستانی وە بەهۆی سەرکەوتنی بە پلەی شارستانێتی دا ووتەیان زۆر بووە و جوان بووە. یەکێك ئەگەر باش ووردبێتەوە لەووتەی (باڕە) و (باعە)ی مەڕ و بزن و (بۆڕە)ی گا و (تەقە)ی تفەنگ و (جڕوکە) و (جرییوە)ی چۆلەکە و (جووکە)و (جیکە)ی جووجەڵە و (جیڕە)ی دەرگا و (چرکە)ی بنمیچ و (حەپە)ی سەگ و (حیلە)ی ئەسپ و (خرتە)ی مشك و (خرچە)ی شووتی لەکاتی لەتکردنیا و (خڕە)ی گوێز و (خرمە)ی ترۆزیی لەکاتی خواردنیا و (خشە)ی بارە قامیش و (خوڕە)ی ئاو و (خوشە)ی شیر لە کاتی دۆشینیا و (خیزە)ی سنگ و (زڕەی) پارە و (زرمە)ی پێی وولاخ و (زرنگە)ی پاوانە و (زیڕە)ی پڵنگ و (زییکە)ی مشكو (شڵپە)ی ئاوو و (شڵقە)ی مەشکە و (شەققە)ی شووشە لەکاتی شکانیا و (شرییخە)ی هەورە تریشقە و (فیشکە)ی مار (فییکە)ی لێوو (فڕە) و (قنگە)ی بەردی قۆچەقانی و (قاسپە)ی کەوو (قرتە)ی مریشك و (قرچە)ی دار لەکاتی شکانیا و (قڵپە)ی گۆزە و (قڕە)ی بۆق و (قرمە)ی داری ئەستوور لەکاتی شکانیا و (قۆڕە)ی مانگا و (قووقە)ی کەڵەشێر و (قوڵپە)ی شتی شل لەسەر ئاگر و (کڕە)ی بەر داش و (کزە)ی مەنجەڵ لەسەر ئاگر و (کسپە)ی شییشی سورەوە بوو لەکاتێکا کە بکرێ بە ئاوی ساردا و (گارە)ی مریشکە بەکڕو (گرمە)ی هەورو (گڕژە) و (گڤە)ی ڕەشەبا و (گیزە)ی مێشوولەو (لوورە)ی گورگ و (مڕە)ی سەگ و (مشە) و (منگە)ی لووت و (میاوەی)ی پشیلە و (وییزە)ی وییزی وییزە و (هاڕە)ی تاڤگە و (هاژە)ی بارەگەڵا، ئنجا ئەگەر یەکێك لەم ووتانە ووردبێتەوە باوەڕئەکا بەقسەکەی پێشوو کە ووتمان سەرچاوەی ووتان دەنگ بووە، نەخوازەڵا کە گوێ بگریین لەمناڵی ساوا لەکاتی زمان گرتنیا وەلێی ووردبیینەوە ئەبینین کە زۆر شت ناو ئەبا بەناو ئەو دەنگەی کە لێوەی دێ وەك (بەعە) بۆ مەڕو بزن چونکە ئەباعێنێ و (جزە) بۆ گۆشت چونکە لەکاتی سوورکردنەوە و برژاندنیا چز و هووڕی لێوە دێ و (حەچە)و (هەچە) بۆ گوێ درێژ چونکە بەم ووتانە لێی ئەخوڕن.

**( جیابوونەوەی زمان و ووتەی گەلان )**

کاتێك کە ئا دەمیی زۆر بوون و پەرەیان سەند وە پەل و پۆیان هاویشت و جێگایان نەبۆتەوە لەو ناوچە و شوێنانەی کە تیابوون بە ناچاریی بلاوەیان لێ کردووە، وە هەر کۆمەڵەی ڕووی کردۆتە وولاتێك، وە لەشوێنێکی تازە دابەزییون و جێ گیربوون، دیارە هەموو شوێنێك جۆرە چەشمەندازێك و چەشنە سەرما و گەرمایەکی بووە، وە هەر قەڵەم ڕەوێك جۆرە کالاّ و پێخەف و نوێن و خانوو بەرەیەك، و چەشنە ناومالّ و خانوویەکی ویستوە، نەخوازەلاّ کە هەزاران شتی واش بووە لە نیشتمانە تازەکەیانا کە لە نیشتمانی پێشوویانا نەبووە، ئنجا چەند ساڵێکی دوور و درێژ خەریك بوون تاووتەیان بۆ ئەو شتە تازانە داناوە، وە توانییویانە مەبەست لێ بدەنەوە لەو شتانەی کە تازە بەرچاویان کەوتووە، وە یا تازە پێویست بوون پێی، جگە لە پاش و پێشکردن "قلب" و گۆڕین "ابدال"ی پیتێك بە پییتێکی تر کە ئەمانە هەمیشە لە هەموو زمانێکا بەسەر پییت و ووتەدا هاتوون و دێن، جا لەبەر ئەمانە هێندێ لەووتە کۆنەکان فەرامۆش کران، وە گەلێکیش تاشران و ڕێك خران وەك گەلێك لە جاران جوانتر کران، بە ڕەنگێکی وا کە لە ووتەکۆنەکان نەئەچوون، تاوای لێ هاتکە زمانەکەی پێشوویان پێچرایەوە، وە هیچێکی چەندانی وای نەما مەگەر دانەدانەیەك نەبێ کە بلاوبوونەتەوە بەناو گەلێك لەزمانەکانا، وە بەڕێکەوت لەم لاو لەولا تووشیان ئەبیین(3).

جا بەم بۆنەیەوە زمانی هەموو گەلێك لەگەڵ زمانی ئەوانی تر جیابووەوەو زمان زۆر بوون بەڕەنگێکی وا کە هێندێ لەو زمان زانانەی کە ئەم جۆرە شتانە ئەکۆڵنەوە وە ژمارەی زمانی سەر زەوی یان گەیاندۆتە (2600)زمان.

**( لق و پۆپی زمان )**

زانایان و شارەزایان بەبناغەو لق و پۆپی زمان، زمانی ئادەمییان بردووەتەوە سەر چەن شتێك کە یەکێکیان (ئاریی)یە، بنچیینەی زمانیئاریی زمانی (هیندیی) کۆنە کە پێی ئەڵێن (سەنسکرییتی)، (کوردیی) لکێکە لە زمانی ئاریی، هەروەك (ئینگلییزیی) و (ئەڵمانی)و (فەرەنسی) و (ایتالی) و (ئەسپانی) و (یۆنانی) و (پەهاویی) واتە فارسی کۆن لکەکانی تریتی. یەکێك ئەگەر زۆرباش بچێتە بنج و بناوانی ئەم زمانانەوە گەلێ ووتەی وا ئەبیینێ لە ناویانا کە لەیەك ئەچن بەڵکو یەکن (4).

یەکێك ئەگەر باش ووردبێتەوە لەم جەدوەلە تێ ئەگا کە زمانی ئینگلیزی و کوردیی، وە فەڕەنسی و کوردیی چەن لەیەکەوە نزییکن!!

| ئینگلیزیی | کوردیی | ئینگلیزیی | کوردیی |
|---|---|---|---|
| باد | بەد ( خراپ ) | ستنگ | چزووی زەردەواڵە و هەنگ کە بە |
| جوو | جوو ( جوولەکە ) | | بادینانی پێی ئەڵێن ( ئەستینگ ) |
| هەراس | هەراس | | چەنە، چەناگە |
| جەکەل | چەقەڵ | چن | لاق |
| برۆو | برۆ | لێك | لێو کە پێشی ئەڵێن ( لەپ ) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| دڕۆپ | دڵۆپ ( دڵۆپە ) | لیپ | ناو، نام |
| ئێك | هێلکە کە بـەبادینانی پـێی ئـەڵێن | نەیم | نوێ |
| | ( هێك ) | نیو | دوو |
| ئەسپن | ئەسپندار ( سپیبدار ) | تو | نەو کە بە بڵباسییش پێی ئـەڵێن |
| پارت | پارچە | نۆ | نۆ |
| شەیم | شەرم | | لای لایە |
| باند | بەند | لالابای | پەریی |
| هەنیی | هەنگوین | فێری | پشییلە کە پێشی ئەڵێن ( کتك ) |
| ستار | ئەستێرە | کت | باووك کە بە فارسیی پێی ئـەڵێن |
| موون | مانگ | کات | ( پدر ) |
| سپلین | سپڵ | فەژەر | نۆ |
| دۆڕ | دەرگا کە پێشی دەڵێن ( دەر ) | فاژەر | پییرۆز ( ی موبارەکبایی ) |
| | بەرگ ( گەڵای درەخت ) | ناین | کچ کە بـەبادینانی پـێ ی ئـەڵێن |
| بارك | برا، برادەر | پرۆسپێراز | ( دۆیت ) و بەفارسیش پێی ئەڵێن |
| برادەر | دایك کە بەفارسی پێ ئەڵێن ( مادر ) | دۆتەر | ( دختر ) |
| مەژەر | | داوتەر | |
| ماژەر | | | |
| فەڕەنسزیی | کوردیی | فەڕەنسزیی | کوردیی |
| پێ | پێ | ئۆی | ئاو |
| دان | دان | پا پیلون | پە پوولە |
| ژەنو | ئەژنۆ | | |

هەروا ئەگەر بەم ڕەنگە زمانی کوردیی لەگەڵ زمانەکانی ترا بەراوورد بکەین، نەخوازەلاّ لەگەڵ ئەڵمانیدا گەلێ گەلێ زۆرتر و ڕێکتر دەرئەچێ، خۆ کوردیی و فارسی هەر مەپرسە.

**( کورد )**

کورد گەلێکی ئاریی زۆر کۆنە، وە لە پێش سپییدەی مێژووەوە- واتە زیاتر لە هەزار ساڵی پێش میلاد- هاتوون وە لەناو ئەم شاخانی کوردستانە دابەزییون و ماونەتەوە تا ئیمڕۆ(5).

گەلی کورد کۆنترین تییرەیەکن لە ناو ئارییەکانا (6) وە ئەتوانین بەپێی مێژووی چەرخە گرنگەکانی "أدواری رئیسی"ی کورد دابەش بکەین بەسێ بەش.

1-لە سپییدەی مێژووەوە تا پەیدا بوونی دەوڵەتی (ماد) واتە تا هەزار و پێنج سەد ساڵ پێش میلاد.

2-لەپەیدا بوونی دەوڵەتی مادەوە تا هاتنی ئایینی ئیسلام و مسلمان بوونی کورد.

3-لە مسلمان بوونی کوردەوە تا ئیمڕۆ.

**پێگەیشتنی زمانی کوردیی**

سەرچاوەی کوردیی زمانی (ماد)ی کۆنە کە ئاوێستای (زەردەشت) پێغەمبەر بەو زمانە هاتۆتە خوارەوە.

زمانی کوردیی -وەك هەموو شتێکی زیندوو- لەدایك بووە، وە بەرە بەرە پێگەیشتووە و خۆی داڕشتووە، ئنجا بە هەزاران تاشیین و ڕێکخستن و بییراز و چەکوشکاریی بەسەرا هاتووە، و لە بڕبەند و هەسان دراوە، وە بەرە بەرە بە پلەی ئاوەدانیی و شارستانییدا سەرکەوتووە، تا لەدوا دەمی دەوڵەتی مادا گەیشتووە بە پلەی هەرە بەرزی شارستانێتی، یەکێك ئەگەر بە چاوێکی ووردبوونەوە تەماشای ئەو ووتە کوردییە کۆنانە بکا کە (ماد) بۆیان بەجێ هێشتووین، وە ئێمەش لەداوێنی فەرهەنگەکەمانەوە هێندێکی گرنگی -کە شوێنیان لە زمانی کوردییدا چۆڵە- بلاو ئەکەینەوە،

تێ ئەگا کە زمانی کوردیی دوو سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش بەرزترین و دەوڵەمەندترین زمان بووە.

**( جیابوونەوەی شێوەی کوردیی )**

کاتێك کە کوردەکان زۆر بوون، وە لە ناو خۆیانا پەرەیان سەند بڵاو بوونەوە بەناو شاخ و کێوەکانی کوردستانا، ئیتر لە یەکتریی دور کەوتنەوە نەخوازەلا بەهۆی بێ ڕێگایی شاخەکان و چەم و رووبارە گەورەکانەوە، ساڵەهای ساڵ رائەبورد هەورامییەك بادینانی و زازاییەك لوڕیی و فەیلییەك موکریانی و بابانییەك بۆتانی و سۆرانییەك ئەردەڵانییەکی نەئەدیی، ئەمە لەلایەك، لە لایەکی تریشەوە گەلێ لە تیرە و خێڵانی (ماد) هاتوونەتە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئیمڕۆ، وە هەزار و پێنجسەد ساڵ پێش میلاد تێکەڵی تیرەکانی سپی وە یا ئاریی کۆنتری دانیشتووی ئەوێ بوون، وە گەلێ لە ووتەی تیرەکانی ئەوێ- کە ناویان (گۆتی، لۆللۆ، کاسیی، ئێلامی) بووە- تێکەڵاوی زمانی (ماد) بووە، لەدواییدا ئێلاتی فارسی (ماد)ی تێکەڵی خۆی کرد و قووتیدا، ئنجا زمانی فارسی هێزی سەند، وە ووتەی فارسی کەوتە ناو زمانی کوردییەوە(7) لە پاشا ئنجا بە چوار سەد ساڵ پێش میلاد (ئەرمەنی)یەکان و (رووم)ەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای (ئەنادۆڵ) بوون بەدراوسێی کوردەکان، وە گەلێ لەووتەیان تێکەڵ بوو بەزمانی کوردیی(8).

لە پاشا ئنجا ئایینی ئیسلام بڵاو بووەوە بەهەموو کوردستانا وە لە (650) ساڵ پاش میلاد کورد سەرانسەر بوو بەموسڵمان، وە ووتەی عەرەبی کەوتە ناو زمانی کوردییەوە.

لە (900) ساڵ پاش میلاد بەدواوە ئنجا تورکەکان پەیدا بوون، وە حوکمدارییان لە کوردستانا دەستی پێکرد، وە زۆرووتەی تورکی لە زمانی کوردیدا مایەوە، وە بەم بۆنانەوە شێوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کوردستان لەیەك جیا بووەوە، وە گەلێ ووتەی بێگانە لەناو زمانەکەمانا مایەوە.

بێگومانم زمانی کوردیی لە پێش بڵاو بوونەوەی ئەم زمانانەدا، نەخوازەلا لە پێش زمانی عەرەبیدا زمانێکی زۆر دەوڵەمەند بووە، بەڵام لەپاش بڵاو بوونەوەی زمانی عەرەبی ئیتر بەرە بەرە ووتەی عەرەبی بەکارهێنراوە لە نووسیین و قسە و گوفتوگۆدا لەجیاتی ووتەی کوردیی، وە بەم بۆنەیەوە گەلێ ووتەی کوردی فەرامۆش کراو لە بیر چووەوە، ئەمەش ڕێگایەکی ناچارییە بۆ هەموو گەلێکی زەبوونی داگیر کراو کە هەمیشە بەچاوێکی زۆرو بەرز و تایبەتی تەماشای گەلی زاڵ ئەکا، وە ئەیەوێ لە هەموو شتێکا چاوی لێ بکا و لاسایی بکاتەوە، وە بەرەنگی ئەو خۆی رەنگ بکا، وە خۆی لەو نزییك بخاتەوە، نەخوازەلا زمانی عەرەبییش کە زمانی ئایینمانە لەبەرئەوەی کە تا ئێستا فەرهەنگێکی کوردیی نەنووسراوە کەووتەکانمان کۆبکاتەوە و ئاگاداریی بکا، گەلێ ووتەمان فەرامۆش کراوە و لەبییر براوە ئەتوانم بڵێم ئەمە دوو هەزار ساڵە خەرمانی زمانەکەمان لەلایەن دراوسێکانمانەوە بەجەنجەڕی زۆرو ستەم گێرەکراوە و کوتراوە و شەن و کەو کراوە و بەبا دراوە، لەگەڵ ئەمییشە یەشتا لەزمانی فارسی دەوڵەمەند ترە چە جای تورکی بێگومانم ئەوەتەی زمانی کوردیی هەیە گەلێ زمانی تر لەدایك بوون و هاتوونەتە جیهانەوە، لەپاشانەیان توانییوە لەبەر وەیشومەی ڕۆژگارا بوەستن بەڵکو مردوون و لەناو چوون، بەڵام زمانی کوردیی وەك کێوی (پیرەمەگروون) وەستاوە و بنکی داکوتاوە، وە لەبەر هیچ سێڵاوێکی ڕۆژگار و گێژەڵووکەیەکی چەرخی کەچ رەفتارا نەلەرزییوە و دانەچڵەکییوە، ئەمەش وابزانم لەبەر دووشتە.

1-کوردستان شوێنێکی شاخ و داخاویی زۆر سەختی کووڕی وایە کە هەرگیز بێگانە نەی توانییوە تیا هەڵ بکا، وە بەم بۆنەیەوە گەلی کورد هەر وەك خۆی بە پاکیی ماوەتەوە زمانەکەشی بەچاکیی ماوەتەوە.

2-کورد مەردییەکیان هەیە، دوانیان کە لە شوێنێك کۆببێتەوە بەزمانی خۆیان نەبێ قسە ناکەن، وە هەرگیز دەست لە زمانەکەیان هەڵناگرن، نابیینییت؟ برا فەیلییەکانمان سێسەد ساڵە لە بەغدان کەچی هێشتا زمانەکەی خۆیان فەرامۆش نەکردووە، وە لەناو خۆیانا هەر بەکوردیی قسە ئەکەن.

هەموو زمانێك کە قەڵەمڕەوی گەورە بوو، وە سنووری لەیەك دوور کەوتەوە نەخوازەلا کە چەم و رووباری گەورە و شاخ و داخی سەخت و کووڕیشی تیابێ ئیتر شێوەی زۆری لێ پەیدا ئەبێ، وە هەر شێوەیەك چەن شێوەیەکی تری لێ ئەکەوێتەوە، ئنجا بەم پێیە زمانی کوردییش گەلێ شێوەی لێ پەیدا بووە، وە ئەو شێوانەی کە زۆر لەیەك جیابن شێوەی (لوڕ، هەورامی، ئەردەلان، بابان، بادینان، زازا)یە لەگەڵ ئەم شیوانەدا گەلی شیوەی تریشی هەیە بەڵام زۆر لەیەك دوور نیین.

بۆ ئەوەی کە شوینی ئەم شیوانە لە کوردستانا بزانین پیویستە سنووری کوردستان باس وەیەك بەیەك شوینی ئەم شیوانە جیا بکەینەوە.

**( سنووری کوردستان )**

سنووری کوردستانی گەورە نەختیك لەژوور ڕۆ (خلیج)ی فارسی یەوە بەدیوی ئیرانا دەست پێ ئەکا، وە بە قراخ شاری (شیراز) و (ئەسفەهان) و (کاشان) و (هەمەدان) و (تەورین) و (خۆی) و (ئەرییوان)دا ئەروا، وەبەلای (قارس) و (ئەرزرۆم)دا بائەداتەوە، وە لەخوار دەریای رەشەوە شۆر ئەبیتەوە، وە لە ژوور شاری (ئەرزنجان)ەوە ئەروا تا ئەگاتە رۆی (ئەسکەندەروونە) ئنجا دیتە خوارەوە بەژوور (حەلەب)دا تا ئەگاتە رۆژئاوای (سنجار) وە بە رۆژهەڵاتی (بەغدا)دا تێ ئەپەڕێ تا (مەندەلی) وە لەویوە تا رۆی فارسی

**لق و پۆپی زمانی کوردیی**

زمانی کوردیی بەچوار بەش دابەش ئەکرێ:

1-زازا

2-كرمانجی دەستە چەپ "شمالی" كە (بۆتانی) و (بادینانی) و (هەكاریی) و (بایزیدی) و (شەمدینانی)یە.

3-كرمانجی دەستەڕاست كە (سۆرانی) و (بابانی) و (موكریانی) و (ئەردەلانی) و (كەلهوڕیی) و (گۆرانی)یە.

4-لوڕیی كە (بەختیاریی) و (لەكی) و (فەیلی)یە.

بەم رەنگە ڕۆژاوای دەستە چەپی كوردستان هەمووی زازا وە دەستە راستی لەگەڵ كوردستانی ناوەڕاست هەمووی (كرمانج)ە، وەڕۆژهەلاتی دەستە راستی هەمووی (لوڕ)ە.

ئەگەر بمانەوێ شوێنەكانیان یەك بەیەك بزانین بەم جۆرەیە: لەڕۆژهەلاتی (خانەقین)ەوە تا (عەلی غەربی) لەپانی، و لەدرێژیی تا (كرماشان) و (نەهاوەند) لوڕە، لە (بییجاڕ)ەوە تا (گەڕووس) و (جوانڕۆ) و (بانە) و ڕۆژهەلاتی (سیروان) ئەردەلانە، لە (شنۆ) و (لاجان)ەوە بەسەر (سابلاخ) و (سەردەشت)دا تاوەكو (میان دواو) موكریانە، لە (مەرییوان)ەوە تا (سیروان) هەورامانە، لە (سیروان)ەوە تا (زێ)ی بچووك بابانە، لە (زێ)ی بچووكەوە تا (زێ)ی گەورە سۆرانە، لە (زێ)ی گەورە تا شاخەكانی (هەكاریی) بادینانە، ڕۆژهەلاتی شاخەكانی (هەكاریی) شەمدینانە، لەڕۆژاوای (زاخۆ)وە تا (ماردین) و (نسێبین) بەپانی، وە بەدرێژیی لە (سعرد)ەوە تا (دێرزوور) بۆتانە، ڕۆژئاوای (دیاربەكر) بە (ئورفە) و (خەرپووت) و (دەرسیم)ەوە زازایە.

**( پیپتی كوردیی )**

زمانی كوردیی (27) پیپتی هەیە: (ا، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، م، ن، و، هـ، ی)

(ث، ذ، ص، ض، ط، ظ) لەزمانی كوردییدا نیین.

(د)لەسەر دوو جۆرە، (1) گران وەك: (دار، داو، داش، دەنگ، دنگ) (2) سووك وەك: (بدە، مەدە، هەناردان، گولاودان) هێندێ كەس بۆ جیاكردنەوەی ئەم دوو (د)ە لەژێر سووكەكەیانا (.)یەك دائەنێ، بەلام ئێمە ئەمەمان هەڵ گرت لەم فەرهەنگەدا چونكە ئەو (د)ە سووكە هەر لە ناوچەی سلێمانیدا هەیە، جگە لەوە كە لەم رووەوە هیچ مەبەست ناگۆڕیی (ر) لەسەر دوجۆرە، (1) بچووك وەك: (بریین، كەر) (2) گەورە وەك: (ڕەنگ، ڕنگ، ڕم، ڕاو، ڕام)

(ل) دوو جۆری هەیە (1) سووك وەك: (گول، گەل، كەل) (2)قەڵەو وەك: (گوڵ، گەڵ، كەڵ)، (ل ی قەڵەو نیشانەی (7)ی لەسەر دائەنرێ.

(و) لەسەر دوو جۆرە (1) ووشراو وەك: (بوون، چوون، روون) ئەم جۆرە بەدوو (و) ئەنووسرێ، (2) كراوە وەك: (بۆن، چۆن، رۆن) ئەم جۆرەش نیشانەی (7)ی لەسەر دائەنرێ.

(ی) لەسەر دوو جۆرە(1) درێژ وەك :(تییر، بییر، بیی، زیی) ئەم جۆرە بەدوو(ی) ئەنووسرێ. (2) كراوە وەك:(تێر، دلێر، بێرە كولێرە) ئەم جۆرەش نیشانەی(7)ی لەسەر دائەنرێ. (3) خوار وەك: (قوئییل)- كە ئەم خوارییە هەر لە (ی)یە كەوە نیە بەڵكو لەیەك كەوتنی (و) و(ی) یەكەوە بەیا ئەبێ- ئەم جۆرە (ی) یەش نیشانەی (8) لەسەر دائەنرێ.

بۆ ئەوەی كە ووتەی كوردیی چۆن ئەبێژرێ وا بنووسرێ وە ووتن و نووسیین لەیەك جیا نەبێتەوە هەر پیتێك سەری ببێ(هـ) ی پێوە ئەنووسرێ وەك:(رەق، شەل، دەڵ) تا لە خوێندنەوەدا نەكرین بە(رق، شل، دڵ).

ئەگەر خۆی(هـ)ی پێوە بوو ئەوا دوو(هـ)ی بۆ ئەنووسرێ وەك: (بەهبە هـ)، هەر وەك(هـ)ی سەرداریش بە دوو(هـ) ئەنووسرێ وەك: (هەرمێ، هەنار).

هەر پیپتێك بۆری ببێ(و)ی پێوە ئەنووسرێ وەك:(قول، كون، كولك) تا لە خوێندنەوە دا نەكرێن بە(قل، كن، كلك)، ئەگەر خۆی (و)ی پێوە بوو ئەو حەلە بەدوو (و) ئەنووسرێ، واتە نیشانەی(7) ە كە لە جێ(و)ی دووهەم دائەنرێ.

(و)ی بۆردار بە دوو(و) ئەنووسرێ وەك:(ووڕە، ووزە، ووژە) وە ئەگەر ئەم(و)ە بۆرداره (و)یكی تری پێوە بوو ئەو حەلە بەسێ(و) ئەنووسرێ وەك:"وو ون" بەمەعنا خوێن، چونكە ئەگەر بەسێ"و" نەنووسرێ ئەبێ بە"وون" كە مەعناكەی جیایە.

هەر پیپتێك ژێری ببێ(ی ی پێوەئەنووسرێ وەك(سیروان، جیهان) وە ئەگەر خۆی (ی)ی پێوە بوو ئەو حەلە بەدوو (ی) ئەنووسرێ وەك (سییر، بییر، تییر).

(ی)ی ژێردار بە دوو (ی) ئەنووسری وەك (یێ)، وە ئەگەر ئەم (ی) بەژێرداره (ی) یەكی تری پێوەبوو ئەو حەلە بەسێ (ی) ئەنووسرێ وەك بڵێیت(یی ی) كراوە زۆرە.

ئەو پیپتانەی كە ژێری سووكیان هەیە وەك(برنج، ترنج، بزن) (ی) یان پێوە نانووسرێ.

نووسیینی كوردیی تائیستا هێشتا یەكی نەگرتووە، وهەر كەسەبە جۆرێك ئەنووسێ، لەم رووەوە دوو بییرو باوەرر هەیە.

(1) هەموو ووتەیەك بەجیا بنووسرێ وەك (بێخود، بان گوش، بان گردێن، بن باخەڵ، بن قوڵ، بن مییچ، بەجێهێشتن، پێ لێ هەڵ بریین).

(2) هەموو ووتەیەك بەقەد تەوانا پێكەوە بنووسرێ وەك(بێخود، بانگوش، بانگردین، بنباخەڵ، بنقوڵ، بنمییچ، بەجێهێشتن، پێلێ هەڵبریین) من نووسیینی دووهەمم پێ باشترە لەبەر گەلێ شت.

(1) كورتكردنەوەی وەخت، چونكە دەست كەمتر بەرز ئەكەویتەوە، وەزووترشت ئەنووسیت.

(2) كورتكردنەوەی نووسراو، چونكە شتێك كەبەنووسیینی یەكەم دوو دێڕربێ بە نووسیینی دووهەم دێڕونیوێكە.

(3) فارسی-كەبرای كوردییە- بەئیملای دووهەم ئەنووسرێ، نا بینیت(بێدل)- كەلە(بێ) و(دل) دروست كراوە وە(پیغامبر) كەلە(پیغام) و(بر) دروستكراوە، وەبەمەعنا پێغەمبەر وەبەیەكەوە ئەنووسرێن.

(4) ئەم ووتانە کاری پەیوەست "مصدری مرکب"ن واتە هەر چەندە بەدییمەن چەن ووتەیەکن ولێك دراوون بەلآم لەمەعنادا یەك ووتەن، نابینییت؟ (بێلێ هەڵبڕیین) بەمەعنا مبالغە کردنە لە کارێکا،( چاولێقووچان) بەمەعنا بەخشین وبووردنە، (بانگوش) بەمەعنا زەلامێکە کە بان بگیرێ، (بنقۆڵ) بەمەعنا بێچوولەیەکی سێ سووچە کەئەکەوێتە بندەستی کاڵاوە.

(5)زانای بەناوبانگی کورد "یوسف ضیا پاشای خالدیی" ووتەی فەرهەنگە کوردییەکەی خۆی -کە ناوی الهدیة الحمیدیة، في اللغة الکردیة"یە- بە ئملای دووهەمی نووسییوە وەك "نیبڤییکرن، هلهلوك"

(6)نووسیینی کوردیی بە ئیملای دووهەم گەلێ جوانتر و ڕێك و پێك ترە لە هی یەکەم چونکە ئەو بزرِ بزرِ دەرئەچێ وە هیچی بە هیچەوە نانووسێ

(7)ئەم ووتانە لە لاتینی دا بەیەکەوە ئەنووسرێن، کەوابوو تا رۆژێك دێ کە کوردیی بە لاتییینی بنووسرێ باهەر لە ئێستاکەوە پێکەوە بنووسرێن.

**(دەستووری زمانی کوردیی)**

دەستووریی زمانی کوردیی بە "سەرف" و "نەحو"ێیەوە دەستورێکی ئێجگار دووڕودرێژە، کتێبێکی دوسەد لاپەڕەییم تیا نووسیوە، لەبەرئەوە بە پێویستم نەزانی لێرەدا باسی ئەو دەستورە بکەین بەدوورو درێژیی، بەلآم ئەوەندەی کە پێویست بێ بەم فەرهەنگە بەکورتیی باسی ئەکەین.

**(ووتەو لکەکانی)**

ووتە "کلمة" ووشەیەکە کە مەبەستێکی ببێ، وەك "دار، کار، ژن، من، بڕین، دڕین".

ووتە سێ جۆرە "1" ناو "إسم"، "2" کردار "فعل"، "3" پیت "حەرف".

ناوو پییت ووتەن، وە لەم فەرهەنگەدا ئەنووسرێن، بەلآم کردار ووتەیەك نیە کە لە فەرهەنگی کوردییدا بنووسرێن، چونکە بنەڕەتەکەی کەکار "مصدر"ە ئەنووسرێ ئییتر پێویست بە نووسینی کردار نیە.

ناو لەسەر دوو جۆرە "1" تێکڕا "عام" وەك: (دار، بەرد، پیاو، ژن، گورگ، مەڕ) ئەمانە بەووتە ئەنووسرێن لەم فەرهەنگەدا، "2" تایبەتی :خاص" وەك: "نەریمان، سیروان، کرماشان".

ناوی مرۆڤ نانووسرێ، هەر وەك ناوی دێهات و جێگاکانی کوردستان نانووسرێن مەگەر لە حەلێکا کە ئەو ووتەیە مەبەسێکی تری ببێ، وەك: (بانە، دووکان، گەلآلە) کە لەگەڵ مەبەسەکەی خۆیانا ناوی جێگایەکیشن لە کوردستان. لەم حەلەدا ناوی جێگاکەش ئەنووسرێ، هەروا کردار "فعل" نانووسین مەگەر لە حەلێکا کە بەمعنی ناو "اسم"یش هاتبێ وەك ووتەی "بۆ" کە بەمعنی وەرەیە لە هەورامی یا.

**(کار "مصدر")**

کار لەسەر پێنج جۆرە "1" ئەلفی "2" تائی "3" دالی "4" واویی "5" یایی، چونکە لە پێش نوونی "کار"ەوە هەمییشە یەکێك لەم پێنج پییتە. "ا، ت، د، و، ی" ئەبی ببێ، ئنجا بەم بۆنەیەوە هەریەکەی ناو ئەبرێ بەیەکێك لەو پیتانە.

1-کاری ألفیی وەك: (برژان، بێژان، پێچان، سووتان).

2-تائیی وەك: (نوستن، کوشتن، گرتن، کەوتن).

3-دالیی وەك: (کردن، بردن، خواردن، مردن).

4-واویی وەك: (بوون، چوون، دروون، گوروون).

5-یائیی وەك: (زانیین، روانیین، دڕیین، بڕیین).

کار، بەهەر پێنج جۆرەکەیەوە یا سادە "بسیط" ئەبێ یا پەیوەست "مرکب" سادە. کارێکە کە تاقە ووتەیەك بێ وەك (کار)ەکانی پێشوو.

پەیوەست، کارێکە کە دروست کرابێ لە دوو ووتە وەك: (هەڵماڵیین داماڵیین) یا لە سێ ووتە وەك: (پێڵی خستن، پیا هەڵگەڕان، چاولێقووچان) یا لە چوار ووتە وەك: (پێلێ هەڵبڕین، جێ پێلێژ بوون، چەنە بەچەنەوێستان) ئەم پەیوەستانە تا بتوانن لەووتەی فەرهەنگەکەمانا تێکیان ئەخەین وە لە نووسیینا بە تاقە ووتەیەك پیشانیان ئەدەین وەك: (ڕەشبگییر، ڕەهێڵبوون، ڕەنگوڕێش) کە (ڕەش) بەدەم (بگییر)ەوە و (ڕەهێڵ) بەدەم (بوون)ەوە و (ڕەنگ) بەدەم (و)ەکەوە نووسراوون.

پارچەی ئەم کارە پەیوەستانە ئەوی ئیش و کار ئەگەیەنێ وەك: (ماڵیین، خستن، گەڕان، قووچان، بڕیین، وێستان) بێ لەم وێنانەدا پێیان ئەڵێین (بەشی پەیدایی) "جزئی حدثي"، ئەوانی تر وەك: (هەڵ، پێلێ، پیاهەڵ، چاو لێ، پلێ هەڵ) پێیان ئەڵێین: (بەشی پەیوەستی) "جزئی ترکیبیي".

بەشی پەیوەستی لە پێشەوە ئەبێ وەك: (هەڵکردن)، لەدواوە ئەبێ وەك (کردنەوە)، لە هەردوو سەرەوە ئەبێ وەك: (هەڵکردنەوە).

ئەو بەشە پەیدایییەی کە لەدواوە ئەبێ هەمییشە (و)ێك ئەبێ لە ناوەندی دوو (ە)دا وەك: (هاتنەوە، چوونەوە، خواردنەوە)، وە ئەم (ەوە)یە هەمییشە یەکێك لەم سێ مەبەستە ئەگەیەنێ:-

1-گەڕانەوە "عودت" وەك: (هاتنەوە، چوونەوە) بۆ شوێنێك کە لەوەپێش لێی بوو بییت.

2-کردنەوە "تکرار"ی کارێك وەك: (دانیشتنەوە، هەستانەوە، نوستنەوە).

3-بەرە بەرە "تدریج" و هێواشی وەك: (خواردنەوە)ی شتی شل قوم قوم، وە (چوونەوە)ی بەفر بەرە بەرە، وە (بردنەوە)ی یاریی کەم کەم وە بەدزە دزە.

ئەم بەشەیان واتە ئەوەی کە بەشی پەیوەستییەکەی لە هەردوو سەرەوە بێ بە ووتە ناناسرێ، وە لە فەرهەنگەکەدا نانووسرێ، چونکە بە دەستوورێکی تێکڕایی ئەمە ئەزانرێ.

ئەو بەشی پەیوەستی‌یەی کە لە پێشەوە ئەبێ لەسەر دەستوور و باوێکی تایبەتی نیە بەڵکو لەسەر بیستنە، وەچەن ووتەیەکی تایبەتیین کە پێش هێندێ کار ئەکەوون، ئەو ووتانە ئەمانەن: (دا، را، هەڵ، لێ، تێ، ڕێ، ڕۆ، ڕاو، سەر، پیا، تیا، پێ، تێك، پێك، هێ، جێ، فڕێ، پێوە، بەجێ، ڕێپێ، پێ‌لێ، ڕووڵێ، ڕووتێ، ڕووهەڵ، چاوڵێ، سەرلێ، پێ‌لێ دا، پێ‌لێ هەڵ، پێ لێ وەر).

| پەیوەستیی | پەیدایی | پەیوەستیی | پەیدایی | پەیوەستیی | پەیدایی |
|---|---|---|---|---|---|
| دا | هێنان | را | هێنان | هەڵ | هێنان |
| دا | هاتن | را | هاتن | هەڵ | هاتن |
| لێ | کەوتن | پیا | کەوتن | تێ | کەوتن |
| لێ | دان | پیا | دان | تێ | ان |
| تێك | دان | سەر | دان | پێ | دان |
| تێك | خستن | سەر | خستن | پێ | خستن |
| ڕۆ | چوون | ڕێ | کەوتن | بەجێ | هێنان |
| ڕۆ | کردن | ڕێ | خستن | بەجێ | هێشتن |
| ڕاو | نان | هێ | نان | فڕێ | دان |
| ڕووتێ | کردن | ڕووڵێ | نان | پێلێ | خستن |
| ڕێ‌پێ | بردن | تیا | چون | پێلێ | نان |
| ڕێ‌پێ | گرتن | تیا | مان | پێوە | بوون |
| چاوڵێ | قووچان | پێك | هێنان | پێوە | کردن |
| پێ‌لێ‌دا | گرتن | پێلێ هەڵ | بڕین | ڕووڵێ‌وەر | گێڕان |
| پێ‌لێ‌وەر | گێڕان | سەرلێ | بادان | چەنەبەچەنە | وێستان |

ئـەم بەشـە پەیوەسـتی‌یانە هێندێکیـان بەتـەنیا مەبەسـت "معنی"دارن، وە هێندێکیان مەبەستیان نیە، ئنجا هەر کامێکیان بێ کە لەگەڵ بەشـی پـەیدایی‌دا یـەك کـەوتن زۆرجـار مەبەستێکی تـر ئەگەیـەنن کـە جیـاوازە لەمەبەسـتی بەشـەکان وەك: (سەرخسـتن، ڕاکردن) ئێستا لە یەکەمدا (سەر) مەبەستێکی هەیە، (خستن)یش مەبەستێکی هەیە بەڵام کەلە یەك دران مەبەستەکەیان ئەبێ بەمە کە یەکێك لەنزمی‌یەکەوە شتێك بخاتە بەرزیی‌یەك.

لەدووهەمدا (ڕا) مەبەستی نیە"، (کردن) مەبەستەکەی ئەمەیە کە کارێك بکەیت، بەڵام کەپەیوەست کران مەبەستەکەیان ئەبێ بەهەڕا کردن، ئنجا ئەمانە بەووتە دائەنرێن وە لە فەرهەنگەدا ئەنووسرێن. زۆر جارییش مەبەستی پەیوەستەکە هەر مەبەستی پارچەکانێتی وە مەبەسـتێکی زیـاد ناگەیـەنێ وەك: (چوونـە بـازاڕ) ئەمـە بەووتە دانانرێ.

پەیوەست یا ئاشکرا "صریح"یە یا بریتی "کنایە"یە، ئاشکرا ئەوەیە کە مەبەستێکی ڕاست و ڕەوانی ببێ، بریتی ئەوەیـە کـە لـەلاوە مەبەسـتێك بگەیـەنێ وەك: (دەسـت درێـژ، دەسـت بـڵاو، دەست سپی).

زمانی کوردیی زۆر دەوڵەمەندە بەبریتی، وە هەر زمانێك وابێ ناسکتر و بەنەزاکـەت تریینی زمانـە، یـەکێك ئەگـەر وورد ببێتـەوە لەووتەی (بە دەستگرتن، دەست بەئاو گەیاندن) تێ ئەگا کە زمانی کوردیی چەن نازك و بەرزە لەبەر ئەمە هەرچێکمان دەست کەوتبێ لـە بریتـی کۆمـان کردۆتـەوە، وە لەگـەڵ ووتـەدا بـەرییز کراویـی نووسییومانن.

**کاری ڕیشەیی و دەستکردیی**

کاریی ڕیشەیی "اصلی" کارێکە کە لە بنەڕەتا هەر کاربێ، وە بـەهۆی هیـچ جـۆرە شـتێکەوە نـەبووبێ بـەکار وەك ئـەو کارانەی پێشوو.

کاری دەستکردیی "جعلی" ناو یاسیفەتێکە کە بەپاشەکەیەوە (یی) یا (یتیی) یا (ێنیی) یا (ئایـەتی) یـا (هتـی) بـنرێ وەك ئـەم وێنانەی پاشوو.

| ناو | کار | کار | سیفەت | کار | کار |
|---|---|---|---|---|---|
| پییر | پییریی | پییرییێتی | چاك | چاکیی | چاکێتی |
| کوڕ | کوڕێتی | کوڕێتی | سوور | سووریی | سوورێتی |
| دوژمن | دوژمنێتیی | دوژمنایەتیی | جوان | جوانیی | جوانێتی |
| دۆست | دۆستیی | دۆستایەتی | باش | باشیی | باشێتی |
| پیاو | پیاوەتی | | | | |
| ژن | ژنێتی | | | | |

هـەر ووتەیـەك ئەگـەر خـۆی بەکار ئـەهێنرا وە لەگـەڵ (بـوون) یـا (کردن) یا هەر دوکیشیانا بەکارئەهێنرا ئەو ووتەیە هـەر خـۆی بـەو ووتە ئەناسرێ وە لەسەری دێڕەوە ئەنووسرێ، وە لەگەڵ (بوون) و (کردنـا) لـەناو ڕاڤـەکـەیا ئەنووسـرێ وەك: (بچـووك، بچووکبوونـە، بچووك کردنەوە)وە (ئاشکرا، ئاشکرا بوون، ئاشکرا کردن)، بـەڵام ئەگـەر ووتەکە خۆی بە تـەنیا بـەکار نەئەهێنرا وە هەمییشە لەگـەڵ (بوون) یا (کردن) یا هـەردووکیانا بەکارئـەهێنرا ئـەو حەلـە لەگـەڵ (بوون) و (کردن)دا بە ووتە ئەناسرێ وە لەسەری دێڕەوە ئەنووسرێ وەك: (تـەمێ بـوون) و (تـەمێ کـردن) چونکـی (تـەمێ) بەتـەنیا نەبیستراوە.

یاخۆ بە تەنیاش بەکارئەهێنرا وە لەگەڵ (بوون) و (کردن)یشا بەکارئەهێنرا بەڵام لەگەڵ (بوون) و (کردن)ا مەبەستێکی تریان بووە بێجگە لە مەبەستەکەی خۆی، لـەم حەلەشا هـەر بەجیا وە لەسـەری دێـڕەوە ئەنووسـرێن وەك: (بـەخت بـوون) و (بـەختکردن) کـە مەبەستێکی بریتی یان هەیە کە لە (بەخت)ا نیە.

زۆرجار ڕاڤەی ووتەیەك ئەکەین بە ووتەیـەکی وا کـە دوو سـێ مـەعنای هاتووە، وەك ڕاڤـەی (ووژاردن) بـە (بـژاردن) ئەمـە مـەعنای وایە کە ئەو ووتەیەش ئەو دوو سێ مەعنایەی هاتووە:

بۆ ڕییز کردنی ووتـەی ئـەم فەرهەنگـە لـە پییتـی یەکەمـەوە تـا پییتـی دوایـی بـەرچاو خـراوە، هـەر وەك پییتـی سـەر و بـۆر "إعراب"یش بـەرچاو خـراوە بـەم ڕەنگـە ووتـەی (ئـاژاژك) لـەپێش (ئاژاژیی)یەوە، وە (ئاژاڵ) لە پێش (ئاژاوەوە نووسراوە، هـەر وەك (ووڕێنە) لە پێش (وورگ)ەوە نووسـراوە چونکـی پییتی چوارەم لـە (ووڕینە)دا (ن)یە بەڵام لە (وورگ)دا (گ). وە (ڕ) لە پێش (گ)ەوەیـە (بەئاوادان) پێش (بهارە) ئەکەوێ چونکە پییتی سێهەم لە یەکەمدا ئـەلف لەسـەر ئەلفە، بـەڵام لـە دووهـەما ئـەلف لەسـەر ڕێیـە، (ل)ی سووك لەبەر ئەمەی بێ نیشانەیە پێش (ڵ)ی قەڵەوە خراوە بەم







رەنگە نووسراوە (گول) ئنجا (گوڵ) ئنجا (گۆل) ئنجا (گۆڵ)، یاخۆ (پچکۆلە) ئنجا (پچکۆڵە) وە (پچکەلە) ئنجا (پچکەڵە)، هەروا (و)ی سووکی بێ نیشانە پێش (و)ی نیشانەدار خراوە بەم رەنگە نووسراوە (کون) ئنجا (کۆن)وە (قول) ئنجا (قۆڵ)، بەم ڕەنگە هەموو خوێندەوارێك زۆر بە ئاسانیی ئەتوانێ هەموو جۆرە ووتەیەك لەم فەرهەنگەدا بدۆزێتەوە بە بێ گیروگرفت.

**(نیشانەکانی ئەم فەرهەنگە)**

هەموو ووتەیەك لەسەری دێڕەوە لەناو دوو کەوان ()دا نووسراوە، ئنجا ئەگەر ووتەکە کوردیی نەبوو بەم رەنگە لە زمانیکی ترەوە وەرگیرابوو ئەوا لەلای راستی کەوانەکەوە نوختەیەك دائەنرێ.

هەر ووتەیەك هەورامی بێ (هـ) بادینانی بێ (با) زازا بێ (ز) ئەردەڵانی بێ (د) لوور یا لەك یا فەیلیی بێ (ل) لە تەنیشتی چەپەوە ئەنووسرێ، موکریانی و پشدەریی و هەولیریی و گەلی شوینی تر وەك ووتەی خۆمان -کە کرمانجییە- هیچی بۆ نانووسیین، چونکە زۆر لەیەك جیانیین.

ئەگەر ووتەکە دووسێ مەبەستی بوو هەر مەبەستەی هی شوینیك لەم شوینانە ئەو حەلە ئەم نیشانانە لەدوای کەوانەکەوە نانووسرێ بەلکو لەدوای تەواو بوونی مەبەستەکەوە ئەنووسرێ، وە ئەگەر دوو یا سێ مەبەست هی شوینیك بوو لەو شوینانەی ئەو حەلە بۆ هەر مەبەستیك نیشانەکە ئەنووسریتەوە.

زۆر لەووتەکان گەلێ مەبەستیان بۆ نووسراوە، ئنجا ئەگەر لە ناوەندی مەبەستەکانا (.) دانرا ئەوە مەبەستیکی ترە، وە ئەگەر (:) دانرا ئەوە لەجێی ووتەی (ئەبیژی) بەکاردینرێ، وە وینەیەکی بەکارهینانی ئەو ووتەیە نیشان ئەدا، وە ئەگەر (،) دانرا ئەوە بەستنەوەی ووتاریك بەووتارەکەی پیشووەوە ئەگەیەنێ.

زۆر سوپاس بۆ کاك (مەلا محمدی کوردیی) کە لەم فەرهەنگەدا زۆر یارمەتی دام، جارێ جگە لەوە کە سێ جار بۆی نووسییومەتەوە لەسەرەوە تا خوار لە ووتە دۆزیینەوە مەبەست لیدانەوەشا زۆر یارمەتی داووم، بەراستی یارمەتییەکەی شایانی سوپاس و ستایشە هەروا سوپاس بۆ ئەو دۆست و برادەرانەی کە یارمەتی یان داووم وەووتەیان بۆ ناردووم نەخوازەڵا کاك شاکر فتاح و جەمال نەبەز کە ئەویان (150) ووتەی پشتکۆوە ئەمیان (415) ووتەی کوردەکانی سووریەی بۆ ناردووم.

30-8-1959م

26-1-1379هـ

# بەشێ لە فەرهەنگی خاڵ

(بەرپەرچ) د. پەرژیین

(بەرپەرچدانەوە) بەرپەچدانەوە

(بەرپێچ) د. مووروولەیەکە لەسەری ئەو سەری بورغووتوندئەکرێ بۆ ئەوەی کە بورغوەکە دەرنەیەت

(بەرتل) د. پارە یامی یامیچێکە کە لە یاریی(مووشێن) دا لەبەرتییلی هەڵماتا دائەنرێ.

(بەرتەرەف) شتێکە کەلە کەڵك کەوتبێ

(بەرتەلانە) بەتێڵانە

(بەرتەوبۆڵە) برت وبۆڵ.

(بەرتیشت) ز. بەرچایی.

(بەرتێڵانە) د. دیارییەکە لە ماڵی زاواوەئەنێرری بۆ ماڵی بووك بەر لەگواستنەوەی.

(بەرتییل) شتێکەکە بیدەیت بە یەکێك کە کارێکت پیّە بێ بۆ ئەمەی ئەو کارەت بۆبکا.

(بەرتییلخواردن) بریيتی یە لە بەرتیل وەرگرتن.

(بەرتییلخۆر) کەسێکە کەبەرتییل بخوا.

(بەرتییڵکردن) د. قسە کێشانەوە لەیەکێك

(بەرجفت) د. بەرەجووت.

(بەرجل) ز بەروانکە.

(بەرجەوەن) د. چەشمەنداز: ئەم خانوە (بەرجەون)ی خۆشە.

(بەرجەوەنگ کردن) لێکدانەوەی قسە لەپێش کردنیا بۆبەراووردیی چاکیی و خراپی قسەکە: قسە تا(بەر جەوەنگ) نەکەیت مەیکە.

(بەرجێنك) ز. بەرچاوگەی ژنان.

(بەرچا) بەرچایی.

(بەرچاڤك) ز. چاویلکە.

(بەرچاو) شتێکە کە هەمییشە لە پێش چاو بێ.

(بەرچاوتارییکبوون) بریيتی یە لەرق هەستان وتوووڕە بوون.

(بەرچییخ)

بەرچاوتەنك) مەردومی رژدی چرووك.

(بەرچاوتەنگی) بریيتی یە لەرژدیی وچرووکی.

(بەرچاوتێر) مەردومی دڵفراوان

(بەرچاوتێریی) بریيتیییە لە دڵفراوانی.

(بەرچاوگە) پارچە خشڵێك یا چەن زەنگیانەو مووروویەکی هۆنراوەیە ژنان بۆ جوانیی ئەیکەن بە پێش سەریانا

(بەرچاوە) د. بەرچاوگە مێش رەوێن.

(بەرچایی)خواردنێکە کە بەیانیان لەگەڵ چایید ئەخورێ.

(بەرچنۆکە) بەرچنەی بچووك

(بەرچنە) سەبەتەی تووڵیینی قووڵی لاپانە مییوەی تیا ئەبرێ بۆ دوور.

(بەرچەپ) د. مێمڵ: فیسار کەس(بەرچەپ) ی فیسار شتە.

(بەچینەك) ز. چیکڵدانەی مەل

(بەرچییخ) بەرچییغ

(بەرچییغ) سەرپەلی سپیدار کە بارییك و درێژ بێ. تێلا.

(بەرچیین) زەویی یەکە کە(خەرتە) نەکرابێ، بەڵکو هەر تۆوی پێوە کرابێ و کێلرابێ.

(بەرجیینە) بەرچنە.

(بەرخ) ساوای مەرر چەنێرچە مێی تا کاتی برییینەوەی بەرگنەکەی

(بەرخستن) فررێ دانی بەچکە لەسکا بەناکامیی.

(بەرخوار) خواردەمەنی یەکی کەمە کە جوێ کرابێتەوە لە ئازووخەیەکی زۆر بۆ ئەمەی کە لەبەر دەستا بێ بۆ خواردن. شتی خوار وخێچ(ز).

(بەرخوان) ز. بەرخەلەوان.

(بەرخۆر) بەرخوار. کەسێکە کە بەمێچکە مێچکەو قسەی خۆش خۆی بباتە پێشەوە لای مەردوم بۆ ئەوەی کە بەروبوومیان بخوا.

(بەرخوردار) کەسێکە کە عەمری ئەوەندە درێژ بێ لە بەری نەتەوەی خۆی بخوا کەیف خۆش(ز).

(بەرخورك) ز. تەرزەی پچووك

(بەخۆلە) بەرخی ساوا.

(بەرخەل) بەرغەل.

(بەرخەلەوان) بەرغەلەوان.

(بەرد)شتێکی رەقی تورتی قورسی ئاشکرایە لەزەوییدا.

(بەردار) درەخت و سەوزاییییەکە کە بەری ببێ.

(بەرداش) بەردێکی پانی گردە کونێك لە ناوەڕاستیایەیی، دانەوێڵەی پێ ئەهاڕرێ.

(بەرداشت) گونجان.

(بەردان) بەرەڵاکردنی شتی گییراو

(بەردانەوە) بەردانی ئاوی گییراو.

فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە.

(بەردانیی) بەردەڵان.

(بەرداوێژ) ئەندازەی هاویشتنی بەردە دەستی زەلامێک: خانووی ئێمە لە خانووی ئێوەوە (بەرداوێژێك) دوورە (بەرداویی) بەردانیی.

(بەردایی) بەردانیی.

(بەردتاش)کەسێکە کەبەردێك بخا بۆ دییوا "نقار"

(بەردڕکانە) خواردەمەنی‌یەکە ئامادە کرابێ لەلایەن یەکێکەوە کە کالآیەکی تازەی لەبەرکردبێ بۆ چەن هاوڕێیەکی.

(بەردڕەکانە) بەردڕکانە.

(بەردکێش) کەسێکە کە بە پارە بەرد بگوێزێتەوە بۆ ئەم و ئەو.

(بەردڵ) د. بەرقلیان.

(بەردڵخستن) خواردنیی بەرقلیان.

(بەردلك) ز. خۆشەویست.

توورەکەی مەمك.

(بەردڵکەوتن) حەزکردن لە شتێك‌و چوونی بەدڵا.

(بەردۆڵە) د. سوێنەیەکە نانی تیا هەڵئەگییرێ. تەغاراوی پیینەچی‌و ئاسنگەر.

(بەردووخ) بەردێکە ئەخرێتە سەر پێچکەی خەرەك بۆ ئەمەی کە نەبزوێ

(بەردووگ) پێستی ژێر دووگی مەرر.

(بەردە) د. بەندەی زەررخرییدە چنێر چمێ.

(بەردە ئازەبە) بەردە عازەبە.

(بەردە ئەستێ) جۆرە بەردێکی شیینکارە بەلێدانی ئەستێ ئاگردێنێ

(بەردە ئەموستییلە) نقێمی ئەموستییلە

(بەردەبار) ز. پیاوی ژییرکە سەری لە هەموو شتێك دەرچێ.

(بەردە باران) بەرد فڕێدان بۆ یەکێك بەزۆریی.

(بەردەباریی) ز. حکمەت‌و پسپۆریی.

(بەردەباز) بەردێکە لەناو ئاوا دانرا بێ بۆ پەڕیینەوە.

(بەردە بییرۆ) بەردێکی زۆر خەستە شتی شل کە زۆر تونـد بووبێتەوە پێی ئەشوبهێنرێ: دۆشاوەکە ئەوەندە خەست بۆتەوە بووە بە (بەردە بییرۆ)

(بەردە پێ) جۆرە بەردێکی زبری‌سووکە لە حەماما ئەهێنرێ بەبن پێ‌دا بۆ لابردنی چڵك.

(بەردەتووتن) شییشێك توتنە لە هەموو (کەلارێك) دەرئەکرێ بۆ ئاغا لە پاش سێ‌یەك.

(بەردەرگانە) د. پارەیەکە لە بەردەرگای ماڵی بووك ئەسێنرێ لەزاوا بۆ ئەوەی کە دەرگاکەی لێ بکەنەوە.

(بەردەساو) هەسان.

(بەردەست) کەسێکە لە ژێر دەستی یەکێکا هەڵسووڕێ بۆ فرمان کردن. شتێکی سووکەڵەیە لە بەردەستا دائەنرێ بۆ فرمانی هەمییشەیی. بەرێکە ئەگییرێ بەسەر قۆڵی سەڵتە و کەوادا لەدییوی ناوەوە.

(بەردەستە) پارچەیەکە ئەدرێ لەسەر دەستی کەواو سوخمە و سەڵتە لە دییوی ناوەوە.

(بەردەستیی) ئییشکردن لەبەر دەستی یەکێکا. کرێکار (ز).

(بەردەتووتن) شییشێك توتنە لە هەموو (کەلارێك) دەرئەکرێ بۆ ئاغا لە پاش سێ‌یەك.

(بەردەرگانە) د. پارەیەکە لە بەردەرگای ماڵی بووك ئەسێنرێ لەزاوا بۆ ئەوەی کە دەرگاکەی لێ بکەنەوە.

(بەردەساو) هەسان.

(بەردەست) کەسێکە لە ژێر دەستی یەکێکا هەڵسووڕێ بۆ فرمان کردن. شتێکی سووکەڵەیە لە بەردەستا دائەنرێ بۆ فرمانی هەمییشەیی. بەرێکە ئەگییرێ بەسەر قۆڵی سەڵتە و کەوادا لەدییوی ناوەوە.

(بەردەستە) پارچەیەکە ئەدرێ لەسەر دەستی کەواو سوخمە و سەڵتە لە دییوی ناوەوە.

(بەردەستیی) ئییشکردن لەبەر دەستی یەکێکا. کرێکار (ز).

(بەردەستییکردن) هەڵسووڕانی یەکێك لەبەردەستی یەکێکا.

(بەردەشۆرکردن) شتنەوەی برنج و نیسك و ماش بەڕەنگێك کە بەردەکەی لێ بگییرێ.

(بەردەعازەبە) بەردێکی قورسە کوڕانی هەرزەکار بەبەرزکردنەوەی هێزی خۆیانی پێ تاقی ئەکەنەوە.

(بەردەڤك)ز. یاوەر "مرافق".

(بەردەقانیی) قۆچەقانیی.

(بەردەڵان) بەردەڵانیی.

(بەردەڵانی) شوێنێکە کە بەردی زۆر بێ.

(بەردەڵبەرد) دەربەدەریی و سەرگەردانیی بەڕەنگێك کە هەر دەمەی لەجێگایەك وە هەر ڕۆژەی بەشاخێکەوە بێ

(بەردەم) پێش دەمی شت.

(بەردەمۆرە) شتێکی پچکولانەی تەنکە لەقوڕی (کربلاء) و (نجف) سوور ئەکرێتەوە، شییعە لە نوێژا ناوچەوانی ئەخاتە سەر.

(بەردەنوێژ) بەردێکی پانی تەختی درێژە نوێژی لەسەر ئەکرێ.

(بەردەوازە) بەردەباز

(بەردەهاڕ) بەرداش

(بەردەی) هـ.بردن

(بەردێلیی)ز. گۆڕیینەوەی شت بە شت.

(بەردییل) مەڕی سێساڵانە

(بەڕ) بەرە. شاڵیینە

(بەڕانی) بێگانە.

(بەرڕەتخستن) بەرگییرخستن

(بەرڕەتکەوشن) بەرگییرکەوتن

(بەرۆژوو) رۆژۆوان، (بە ڕۆژوو بوون) ڕۆژووگرتن

(بەڕوو) بەری دارێکی گەڵا پان کێوییە، درێژکۆڵەیە و توێکڵ و کڵاوی هەیە. ئەو دارەیە کە بەڕو ئەگرێ.

(بەڕوودار) داری بەڕوو

(بەڕوولە) دارێکی پچکۆلەیە ئەکرێ بەکۆنی (هەپە)دا تا هەپەکان دەرنەیەن. ترۆزیی و خەیاری ناسك.

چەن سنگێکی بارییکە تەختەی دەواری پێ لێك ئەدرێ. گاینجە.

(بەڕوولەخۆرە) کونی هەیە

(بەڕە) ژێ ڕە خەرێکە لەبەن دروست ئەکرێ.

(بەڕەپۆ) د.کلییم

(بەڕەزا) گیایەکی گەڵاووردی پڕی کێویی بەهارییی‌یە لە تەڕەتییزە ئەچێ.

(بەڕێکردن) خستنە رێی گیاندار و پێك هێنانی پێویستی ڕێگای.

(بەڕێوچێ) کردار یا گوفتارێکە کە لەجێی خۆیابێ.

(بەڕێوشوێن) بەڕێ و جێ

(بەڕێوەبردن) سەرپەرشتیی و چاودێریی کردنی شتێك.

(بەڕێوەچوون) برییتی‌یە لە گوزەڕان کردن.

(بەرز) بڵند.

(بەرزا) د.منالّی نۆبەرە. بەرزایی

(بەرزاخوڕ) وولاخێکە ئالییکی زۆری کرابێتەبەر و ئەوەندەی خواردبێ خواردنی لەبەرچاو کەوتبێ، یاخۆ خواردنی خۆشی درابێتێ و خواردنی تری پێ نەخورێ.

(بەرزاخ) د.دامێنی کێو

(بەرزایی) ئەندازەی بڵندیی شت شوێنی بەرز.

(بەرزبوونەوە) بڵندبوونەوە

(بەرزفڕیین) برییتی‌یە لە کەسێك کە زیاد لە ئەندازەی خۆی بخورێ و قەپ دابگرێ.

(بەرزڤك) ز.بەرهەڵستێکە کە لەدار دروست کرابێ.

(بەرزکردنەوە) بڵند کردنەوە

(بەرزە) چێشتی پلاو. وون: (بەرزە)م کرد، واتە وونم کرد

(بەرزەبلێس) کەسێکە لە هەموو قسە و گفتوگۆیەکدا تێهەڵ بچێ بە رەنگێك کە بەرامبەرەکەی دەم کوت بکا

(بەرزەبلێسوێستان) تێ هەڵچوون لە هەموو قسە و گوفتوگۆیەکا و بەگژ دەما چوونەوە.

(بەرزەجرە) جۆرە وییز وییزەیەکە هەر جرەجڕ ئەکا

(بەرزەچرە) بەرزە جرە

(بەرزەحەوایلە)د.کۆلارەی منالان

(بەرزەربینە)ز. زوبەرجەد

(بەرزەکی بانان) ووتەیەکە تەشبیهی یەکێکی پێ ئەکرێ کە لە چورتمێك بە ئاسانی رزگاری بووبێ.

(بەڕزەگەوە) قیسپێکی هەڵ نەپاچراوە ئەکرێ بەپەرژیین بەبێ تەنیین

(بەرزەلنگ)گیایەکی بۆن خۆشی کوێستانی‌یە ئەی خەنە ناو لێفە و سەرییینەوە بۆ بۆنخۆشیی.

(بەرزەوولاخ) ماین و ئەسپ و ئێستر

(بەرزەوەبوون) بەرزبوونەوە

(بەرزەهەوایلە) د.بەرزەحەوایلە

(بەرزیی) بەرزایی

(بەرزییلان) د.یاریی شێر و خەت بەپارە

(بەرزیین) وولاخێکە کەکاتی زیینی هاتبێ

(بەرژەنە) ژەمەنێك کەرە

(بەرژەنەك) دارێکی تەنکی پانە لەبەردەمی (دانە) و (گورد)ا دائەنرێ بۆ راگرتنی ئەندازەی پانیی تەنراوە کە بۆئەوەی کە خوار و گێڕ نەبێ.

(بەرستۆ) ز.بەرۆك

(بەرسڤ) ز.وەرام

(بەرسمێڵ) مووی سمێڵەکە لە لێوتێ پەڕێ، (بەرسمێڵکردن) قرتاندنی مووی بەرسمێڵ.

(بەرسووڤ) ز.هەموو شتێکی پاش و پێش کراوی هەڵ گەڕاوە

(بەرسێڵ) جۆرە کولێرەیەکە بە ساج ئەکرێ.

(بەرسینگ) ز.قایشێکە کە ئەکەوێتە بەر سنگی وولاخی بەرزە لەکاتی زیین کردنیا.

(بەرسییلە) بەری مێو کە هێشتا ترش بێ.

(بەرسیینە) سیینەبەرە.

(بەرشووش) ز.بەرسووڤ.

(بەرشێو) خۆرانی ئێواران، (بەرشێوکردن) نان خواردنی ئێواران.

(بەرشی‌یەی) هـ.دەرچوون.

(بەرغەل) رانی کارو بەرخ.

(بەرغەلەوان) شوانی کاروبەرخ.

(بەرف) ز.بەفر.

(بەرفخورك) ز.تەرزە.

(بەرفڕێدان) دانانی بەچکە و منالّ بە نە بەکامیی.

(بەرفمالّك) ز. بەفرمالّ.

(بەرفەشۆ) ز.بەفرێکە کە لەگەلّ بارانا بباریّ.

(بەرفەك) ز.جۆرە پێچ و مێزەرێکە

(بەرڤالە) ز.دەست ڤالە.

(بەرڤانك) ز.بەرکۆش.

(بەرڤیین) ز.مردن لەرێگایەکی ناشییرنا.

(بەرقلیان) بەرچایی.

(بەرك) گوللە (ز). ئەستێرەیەکە بەعەرەبی پێی ئەڵێن: شیعرای شامی.

(بەرکار) کە رەمەی خانوو کە ئامادە کرابێ بۆ کردیی.

(بەرکاز) ز.پەنجەرە.

(بەرکانیی) ز.بەردەقانیی.

(بەرکاو) د.بەرزاخ

(بەرکردن) د.لەبەرکردن.

(بەرکۆ) د.قەرپووسی زیین.

(بەرکوت) دانەوێڵەیەکە لە پێش کوتانی خەرمانا ئەکوترێ بۆ نان.

(بەرکوڕ) ز.گۆشتی ژێر چەناگەی مەردومی قەڵەوکە دائەکەوێ.

(بەرکۆستە) ز.پیاوی رییش تەنك

(بەرکۆسە) ز.بەرکۆستە.

(بەرکۆش) پەشتەماڵێکە ئەگیرێ بەبەرکۆشەوە لەکاتی فرمانا بۆپاك و خاوێنی.

(بەرکوڵ) ئەندازەیەکە لە چێشت کە لەپێش پێ گەیشتنیا بخورێ،
(بەرکوڵ کردن) خواردنی کەمێك لە چێشت لە پێش پێگەیشتنیا.
(بەرکۆڵە) دارێکە وەك (چاکڵ) ئەخرێتە ناوەندی (مژان) و (ئێرەق) تاکار باش بکا.
(بەرکەتیی) ز.شتی گران مایە و بەنرخ.
(بەرکەش) ز.سیینی.
(بەرکەك) ز. پەیژە. پێپیلکە
(بەرکەکردن) ووتەیەکە لە ووتاری نزادا بەکارئەهێنرێ: مانگاکەت
(بەرکەکا) شبیری زۆرە.
(بەرکەڵ) نێوونێکە کە کاتی کەڵگرتنی هاتبێ.
(بەرکەمەر) گیایەکی بۆن خۆشی گەرمیانییە.
(بەرکەوتن) پێش کەوتن. کەوتنی شتێك لە شتێك: شووشەکە بەردێکی (بەرکەوت). نۆرە هاتنە سەر: ئیمرۆ زوو تۆرەت (بەرکەوت). پێ بڕران: تۆش ئەوەندەت (بەرئەکەوێ)
(بەرکەیە) ز.نوێنەر. یارمەتی دەر
(بەرگ) کالا. مقەبای ئەم لاو ئەو لای کتێب. گەڵای دار و درەخت و سەوزایی. ئەو ڕێگایەیە کە مەردوم لەرەووشتو خوودا ئەی گرێ "مبدأ" ز. پێشوو: جاری (بەرگ) هاتم، واتە جاری پێشوو
(بەرگان)ز. درێژیی‌یەکە کە نزیك گەزێك بێ.
(بەرگایلکە) باڵندەیەکی پچکۆلەی شیینە زۆرتر لە بەردەمی گای جووتا ئەنیشێتەوە.
(بەرگایی) پێش کەوتنی یەکێك لەبەردەمی گایەکەوە کە تازە خرابێتە ژێر جووت یاگێرە بۆ ڕاهێنانی.
(بەرگدروو) کەسێکە کالا بدروێ
(بەرگر) بەرگرد
(بەرگرتن) پرژاندنی ترشوخوێ بەدەمو چاوی یەکێکا کە (ئاگرە)ی پێ گەیشتبێ لە لایەن یەکێکەوە کە منالی بە ئاگر سووتابێ بۆ ئەمەی کە چاك بێتەوە. بەربەست کردنی شتێك: بەری ئەو ئاوە یا ئەو ڕانەبگرە. هاتنە بەری درەخت. بەرگە گرتن: ئەم وولاخە بۆ ئەم بارە (بەرناگرێ، واتە بەرگەناگرێ. ئاووس بوونی گیاندارێك کە ئادەمی زاد نەبێ (ز). بەربەستکردنی شتی ڕەنگ کراو.
(بەرگرد)شتێکە کە لە بەردەستابێ و بەکاربێنرێ بۆ ئەمەی ئەو شتەی کە لەم باشترە جارێ بەکار نەهێنرێ و بمێنێتەوە.
(بەرگن) تووکی بەرخی تازە بوو کە یەکەم جار بڕابێتەوە.
(بەرگورد) دارێکە ئەخرێتە تەونەوە بۆ ئەوەی کەرِێك بوەستێ. بەرگرد.
(بەرگەرد)ز. جامخانە و شووشەی بەدرەم.
(بەرگەڕەکی) گیانداری جوانی ڕێك و پێکی شۆخ و شەنگ: ئەم پیاوە یا ئەم ئەسپە یا ئەم کەڵەشێرە (بەرگەڕەکی)یە.
(بەرگەش) ز. سیینی زۆر گەورە
(بەرگەشتە) بەدبەخت.
(بەرگەشتەیی) بەدبەختی،

(بەرگەشەیی هاتن) بەدبەخت بوون
(بەرگەشتیی) بەرگەشتەیی
(بەرگەگرتن) خۆڕاگرتنی شت لەژێر بارێکی گرانا.
(بەرگەل) بەرغەل
(بەرگەلەوان) بەرغەلەوان
(بەرگەمێ) هـ. کووزەڵە
(بەرگیر) ز. جۆرە مارێکی زەهراویی کوشندەیە.
(بەرگیرخستن) پەیدا کردنی شتێك و خستنە ژێر دەستی.
(بەرگیر کەوتن) هاتنە ژێر دەستی شتێك کە بە دوویا عەوداڵ بووبیت
(بەرگیرییکردن) د.بەرهەڵست وەستان.
(بەرگیین) د.پێشوو.
(بەرما) ز.بەرماوە.
(بەرماخ) کاغەزێکی لوولە کراوە تووتنی تێ ئەکرێ و ئەکرێ بەجگەرە
(بەرماغ) بەرماخ.
(بەرماڵ) ز.ماوەیەکی تەختە لەبەردەرگای مالا.
(بەرماڵ) پارچە تەنراوێکی تایبەتی‌یە نوێژی لەسەر ئەکرێ. دوو تەختە دەواری لێك دراوی ئامادەیە بۆ ئەوەی هەر کاتێك بایەکی بەهێز هات بگیرێ بە تەنیشت ڕەشمالا، وە بەچەن (سووولە)یەك بە دەوارەکەوە قایم بکرێ بۆ بەربەستی باکە.
(بەرماڵك) با. جاجم.
(بەرماڵی) ز.کەیبانووی ماڵ
(بەرماوە) پاشماوە.
(بەرموور) جۆرە ملوانکەیەکە کە ژنان بۆ جوانیی ڕاست و چەپ ئەیکەنە ملیان.
(بەرموورە) بەرموور.
(بەرمووسڵدان) خوار ناووك.
(بەرمەجێڵ) د.دەرگای چەپەر.
(بەرمەمکانە) منالی شییرە خۆرە.
(بەرمییل) جۆرە سندووقێکی گردی قووڵە لە لەوح یا تەختە
(بەرناف) ز. لەقەب.
(بەرنامە) مەنهەج و پڕۆگرام.
(بەرنوێژ) کەسێکە پێش نوێژیی بکا
(بەرنوێژیی) پێش نوێژیی
(بەروار) با. کوێستان. ناوە بۆ ناوچەیەك لە عەمادی‌یە
(بەروال) ز.ڕێگای خوار و خێچی سەختی ناو شاخ و داخ
(بەروان) پارچەیەکی تایبەتی‌یە لەکاتی نان خواردنا ئەدرێ بەسەر کۆشا. بەروانکە.
(بەروانك) بەروانکە.
(بەروانکە) سەردەرییی‌یەکی تەنکە ئەکرێ بەبەرسنگی منالا بۆ ئەمەی کە کالاکەی پیس نەبێ.
(بەرواپشت) د.بەروپشت.

(بەروبووم) پییت و فەڕی شت: یاخوا لە (بەروبووم)ی منالّەکانت بخۆیت.

(بەروبێشکە) بە بێشکەیەك ئەووترێ کە دۆشەکە و دەسرازەو شتومەکی نوسیتنی منالّی تیابێ.

(بەروپشت) ئاوەژوو، (بەروپشتکردن) وەرگێڕانی یەخەی کراس بە جۆرێك کە پشتەکەی لەبەر ساغی بکەوێتە پێشەوە و پێشەکەی لەبەر دڕاویی بکەوێتە پاشەوە.

(بەرودوا) یەك لەدوای یەك: فارس و نەرییمان بەرودوا لەدایك بوون.

(بەرودواخستن) پاشوپێشکردن.

(بەرودواکردن) بەرودواخستن

(بەرودواکەوتن) پاشوپێش کەوتن

(بەرودوانان) راونان

(بەڕۆژ) ز. بەربەڕۆچکە

(بەرۆش) ز. مەنجەلۆکە

(بەرۆك) یەخە

(بەرۆکبەردان) بریيتیيە لە وازهێنانی یەکێك لە یەکێك

(بەرۆکگرتن) بریيتیيە لە شەڕ فرۆشتن بەیەکێك.

(بەروو) پێشوو

(بەروەج) ز.جۆرە ئاسنێکە کە تفەنگی لێ دروست ئەکرێ. تفەنگ

(بەروەستا) با.شاگرد

(بەروەسێل) ز. ئاگردان.

(بەرە) ووتەیەکە جووتیار بەگای جووتی ئەڵێ لەکاتێکا کە گاکە پشت هێڵ بێ، واتە ڕووی لەبوورە بێ نەتەوە ئەمە (لەبەرە)ی فیسار کەسە.
شتێکی سێ پەلە، پەلێکی بەتەنگەوە و دووپەلەکەی تری بەقەلتاغەوە توند ئەکرێ. دەرگا(ھ). خۆشیی دوای باران (د).

(بەرەبەرە) ووتەیەکە کردنی کارێك یا ووتنی گوفتارێك ئەگەیەنێ کەلەسەرخۆ، وە ووردە ووردەبێ.

(بەرەبێڵ) د.بەرەجووت.

(بەرەبەیان) دەمەدەمی بەیانی .

(بەرەبیین) ھ.زاربێن.

## سەرچاوە

فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ جزئی یەکەم، 1960، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی



اللجنة العليا لاحتفالات بغداد والكندي

مكتب الرئيس التنفيذي
المجمع العلمي العراقي
بغداد — الوزيرية

العدد : ١١٢
التاريخ ٢ / ٧ / ١٩٦٢

سيادة الأستاذ محمد الخال المحترم

تحية كريمة

ستقيم الجمهورية العراقية احتفالاً كبيراً لبغداد « مدينة السلام » بمناسبة الذكرى الألفية لها وللكندي أول فيلسوف العرب والاسلام في المدة الواقعة بين ١ و ٨ من شهر كانون الأول ١٩٦٢ .

ويسر لجنة الاحتفالات العليا ان تقدم لسيادتكم دعوة عامة للاحتفال برعاية سيادة الزعيم الأمين عبد الكريم قاسم رئيس الوزراء والقائد العام للقوات المسلحة للمشاركة الفعلية في هذه الاحتفالات عن طريق وضع الدراسات والأبحاث أو الكتب عن بغداد أو الكندي . آملين ان تعلمنا اجابتكم بقبول هذه الدعوة متضمنة موضوع دراستكم في موعد أقصاه نهاية تموز ، اما آخر موعد لتلقي البحوث والدراسات فهو الاسبوع الأول من تشرين الأول سنة ١٩٦٢ .

وتقبلوا خالص التحية والاحترام

الرئيس التنفيذي
الدكتور ناجي الأصيل

# فەرهەنگی خاڵ

د.فاروق عومەر سدیق

لەیادی (12) دوانزەهەمین ساڵرۆژی کۆچی دوایی مامۆستا (شێخ محمدی خاڵ)دا، بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاوێژ، کتێبی (فەرهەنگی خاڵ) و (پەندی پێشینان)ی ئەو زاتە گەورەیەی بەرەو رووی من کردەوە کە وتارێکیان، لەم یادە پیرۆزەدا، لەسەر بخوێنمەوە، منیش، هەرچەندە خۆم بەشیاوی ئەوە نازانم کە قسە لە بەرهەمەکانی ئەو کەڵەزانا مەزنەی گەلەکەمان بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا، بەمەبەستی لەبیر نەچوونەوە و هێنانەوە یاد و وەفامان بۆ شێخی کوردپەروەر و دڵسۆزمان و بەرێز تەماشاکردنی هەموو بەرهەمەکانی ئەو هەڵکەوتووەمان، ئەو ئەرکەم بەسوپاسەوە گرتە ئەستۆ.

لەسەرەتاوە بە پێویستی ئەزانم کە بڵێم: فەرهەنگ بریتییە لەو کتێبەی کە وشەکانی زمانی بەپێی پەیرەوی تایبەتی زمانەوانی، تیادا تۆمارکراوە.

لەو کتێبەدا، واتای وشە رونکراوەتەوە و هەوڵدراوە بۆ ئەوەی ئاسانتر لەواتاکانیان بگەین، شیش کراونەتەوە، بۆئەوەی هەرچی زانیاریەك کە دەربارەیان هەبێت بەلێلی نەمێنێتەوە.

فەرهەنگ جۆری زۆرە، بەڵام دەشێ (2) چەشنی سەرەکی لێ جیا بکەینەوە:

1–فەرهەنگی ئنسکلۆپیدی: لە رووداو و دیاردە و خەڵك... هتد دەدوێت.

2–فەرهەنگی فیلۆلۆژی: لەوشە ئەکۆڵێتەوە، وەك دانەیەکی سەرەکی زمان (فەرهەنگ).

## هونەری فەرهەنگ دانان

ئایا لە مێژووی لێکۆڵینەوە زمانەوانێکانی جیهاندا، ئەم هونەر و داهێنانە گرنگ و بەنرخە، لەکوێ و لەلایەن کێ و لەکەیەوە بۆیەکەم جار بیری لێکرایەوە و پاشتر هێنرایە دی؟

لەدیراساتی زمانەوانیدا، سەلمێنراوە کە لە هندستانی کۆن، هندێکان بۆ یەکەم جار، چەند سەدەیەك پێش زایین، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە زمانەوانییانەی کە دەربارەی ئاستە جیاوازەکانی بەتایبەتی ئاستی فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی و لێکیکۆلۆژی و کەمێکیش ئاستی سینتاکسیی زمانی سانسکریتیدا، کردیان، دیارە ئەم کارانەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە لەو سەردەمەدا، خەڵکی ئیتر تێ نەگەن لە سرووده ئاینێکانی (رێکوێدا) کە دین و بیروباوەڕی ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو کاتەی هندستان بوو.

ئەم فاکتەرە کۆمەڵایەتی و ئاینییە، پاڵپێوەنەری بنجی و سەرەکی بوو کە زمانەوانانی ئەو وەختەی هندستانی جولاند، بۆ ئەوەی گراماتیکی زمانی سانسکریتی و دەستورێك بۆ زمانی ئەو سرووده ئاینییانە دابنێن.

لەسەدەی (4)ی پێش زایین، کەڵە زمانەوان و زانای بەناوبانگی هندی (پانینی) ئەم ئەرکە گەورە و گرانەی گرتە ئەستۆ بەم کارەی، بەردی بناغەی زانستی زمانی بۆ یەکەم جار، نەك تەنیا بۆ هندێکان، بەڵکو بۆ هەموو میللەتانی جیهان دانا.

پانینی لە رێزمانەکەیدا، لەگەڵ ئەوەدا کە ناوی چەندین زمانەوانی تری پێش خۆی ئەبات، بەڵام ئاستی بەرزی و مەزنی کارە زمانەوانێکانی پانینی، بوون بە هۆی ئەوەی کە هەر پانینی خۆی بەدامەزرێنەری راستەقینە و زانستییانەی لێکۆڵینەوە زمانەوانێکان لە جیهاندا دابنرێت. پڕ بەهایی و بەپێزیی بەرهەمە زمانەوانێکانی هندێکان بەجۆرێك بوو کە دواتر بوون بەکەرەسە و بناغە و رێبازی هەموو لێکۆڵینەوە زمانەوانێکانی عەرەبەکان و ئەوروپاێکان، بەتایبەتی لە مەیدانی فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژیدا کە تا ئەمڕۆ لەکاردان.

هندێکان، یەکەمجار، فەرهەنگیان بۆ ئەو وشانە دانا کە لە (رێکوێدا) هەبوون و خەڵکی لێیان تێ نەئەگەیشتن. ئەم فەرهەنگە ناوی (نیگخانتە ڤاسی Nigxantavas)یە لەسەدەی (5–6) زایینیدا، زانا و زمانەوانی هندی (ئاوارە)، فەرهەنگی سانسکریتی دانا کە تا ئەمڕۆ، لەلایەن پسپۆڕانی زمانی سانسکریتیەوە، لەکاردایە.

بەم جۆرە، هۆکاری سەرەکی کە هاندەر بوو بۆ هندێکان، تا دەست بدەنە کاری فەرهەنگ دانان، (ئاینی و دینی) بووە، ئەمان ویستیان خەڵکی لە سرووده ئاینێکانی رێکوێدا تێ بگەن، بەم کارەشیان، چەندە وشەی هندی کۆنیان لە فەوتان و بیرچوونەوە رزگار کرد، دواتر، پشت بەو کەرەسە رزگارکراوانەی هندێکان بەستراوە و بوون بە بناغەی رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەراورد کاری کە لە ئەوروپا، لەمەیدانی زمانەوانیدا، گیرایە بەر، هەر بەپشتیی ئەم رێبازەش و بە سوود وەرگرتن لەم رێگایە بوو، زمانەوانەکانی جیهان بەسەر خێزان و گروپی جیاواز جیاوازدا دابەش کران. لەگەڵ هندێکاندا، چینێکانیش، دەستیان داوەتە فەرهەنگ دانان، لەسەدەی (2) دووەمی زایینیدا، فەرهەنگی زمانی چینی دانراوە.

لەسەدەی (8) هەشتەمی زاینیدا، خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی، یەکەم فەرهەنگی بۆ زمانی عەرەبی داناوەو ناویشی ناوە (كتاب العين). لە ڕاستیدا، ئەو فاکتەرەی کەوای لە عەرەبەکان کرد، بیر لە فەرهەنگ دانان بکەنەوە، هەر وەکو لای هندێکان، هەر ئاینی و دینی بووە، چونکە ئەمانیش، ویستیان پارێزگاری خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بووە.

یەکێك لەو لایەنە زمانەوانیانەی کە عەرەبەکان بایەخیان پێداوە، (لیکیکۆگرافی) بووە. لەم مەیدانەدا، چەندین فەرهەنگی پڕ بەهایان بۆ زمانی عەرەبی نووسیووە، بەتایبەتی بۆ وشە هاو واتاکان (سینۆنیم)، بۆ نموونە: (صغانی) قاموسی (العباب، واتە شەپۆلی گەورە) ی بە (20) بیست بەرگ، داناوە.

(فەیرۆزی ئابادی)ش، (قاموسی محیط)ی بە (60) بەرگ داناوە، هەر لەم کارەی ئەمیشەوە، لە زمانی عەرەبیدا، ئیتر بە هەموو فەرهەنگێك، وتراوە: (قامووس).

### فەرهەنگ دانان لای کورد

لەم بوارەدا، بەگشتی دەشێ ئەم کارانە بخەینەڕوو:

ساڵی 1682/1683، ئەحمەدی خانی فەرهەنگۆکێکی بەشیعر بۆ یارمەتی دانی منداڵانی کورد کە فێری عەرەبی بن، نووسیووەو ناوی ناوە (نۆبەرە)، کەواتە یەکە فەرهەنگ، لە کوردیدا، کورد خۆی بۆ خۆی داناوە.

یەکەم فەرهەنگ بۆ زمانی کوردی کە لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە نووسرابێ، بریتییە لە فەرهەنگی ئیتاڵیایی-کوردی، ساڵی 1787 لە ڕۆما لەلایەن (قەشە گارزۆنی)یەوە، دانراوە، ئەم فەرهەنگە، دەورووبەری (5) پێنج هەزار وشەی ئیتاڵیایی تێدایەو ماناکانیان بەشێوەی کوردی ئامێدی لێکدراونەتەوە.

ساڵی 1795 شێخ مارفی نۆدێی، (فەرهەنگۆکی ئەحمەدی) داناوە. زانای گەورەی ڕوس (پێوترلێرخ)، لە ساڵانی (1856، 1857، 1858)، (3) سێ کتێبی دەربارەی کورد و کوردستان بڵاوکردۆتەوە.

لە کتێبی سێیەمدا، فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی ژووروو)- ڕووسی و کوردی (زازا)- ڕوسی لەچاپ داوە.

س. ری- میسیۆنێر (مبشر)ی ئەمەریکایی ماوەیەکی درێژ لەناوچەی هەکاری ژیاوەو ساڵی 1870، کورتەیەکی ڕێزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە، لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا، فەرهەنگۆکێکی بیست لاپەڕەیی کوردی- ئینگلیزی نووسیوە. یەکەم فەرهەنگی کوردی- فەڕەنسی کە ئا. ژابا داینابوو، ساڵی 1879 بڵاوکرایەوە.

نزیک کۆتایی سەدەی (19) نۆزدەهەم، ڕۆژهەلاتناس (ئا. سۆتسین)، لە کتێبە ڕێزمانێکەیدا (ڕێزمانی کوردی)، فەرهەنگۆکێکی کوردی ئەڵەمانی داناوە.

ساڵی 1893، یوسف زیائەددین پاشای خالیدی، فەرهەنگێکی کوردی- عەرەبی لە ئەستەمۆڵ چاپ کردووە.

ساڵی 1913، (مێجەرسۆن)، لە پاشکۆی ئەو کتێبەی کە لە لەندەن بڵاوی کردۆتەوە، فەرهەنگۆکێکی (ئینگلیزی- کوردی) داناوە. ساڵی 1916، (نیکیتین)، فەرهەنگۆکێکی ڕوسی- کوردی، لەورمێ بڵاوکردۆتەوە.

پاش شەڕی یەکەمی جیهانی، لە ساڵانی (30) سیدا، دەورو قۆناغێکی نوێ لە مێژووی نووسینی فەرهەنگی کوردیدا، دەست پێ ئەکات. بڵاوبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی و تەوژمی هەوڵ و تێکۆشان و خەباتی بێ وچانی میللەتی کورد، بوون بە هۆی سەرهەڵدان و بەرپابوونی جووڵانەوەی ئەدەبی و زمانەوانیش.

کاری فەرهەنگ نووسی، تا ساڵانی پەنجا، لە چوارچێوەیەکی سست و سادە و ساکاردا مایەوە، ئەوانەی لەو ماوەیەدا بڵاوکراونەتەوە بەگشتی بریتی بوون لە:

(جەلادەت عالی بەدرخان)، لە ساڵانی (30) سیدا، لە بەشێکی تایبەتی گۆڤاریی (هاوار)دا، لیستەیەك زاراوەی کۆمەڵایەتی و پۆلینێکی بەناوی (فەرهەنگۆك) بڵاوکردۆتەوە.

مامۆستا (عەلادین سوجادی)، لە گۆڤاری (نزار)دا، کۆمەڵێك زاراوەی بڵاوکردۆتەوە.

مامۆستا (شاکر فەتاح)، ساڵی 1934، (فەرهەنگۆك)ی بڵاوکردۆتەوە. (زێوەر)، لە ساڵی 1941، فەرهەنگی (عەرەبی- کوردی) داناوە. مامۆستا (گیو موکریانی) یش، دەستێکی باڵاو ڕۆڵێکی گەورەی لە دانانی فەرهەنگی کوردیدا، بینیوە، لە کارەکانی گیو: (رابەر 1950)، (کۆلکە زێرینە 1955)، (فەرهەنگی مەهاباد 1961). د. عزەددین مستەفا ڕەسوڵ، ساڵی 1955، (فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد)ی بڵاوکردۆتەوە.

شێخ محەمەدی مەردۆخ، ساڵی 1956، فەرهەنگی (کوردی- فارسی- عەرەبی) لە تاران چاپ کردووە.

تا ساڵی 1960، فەرهەنگی (کوردی-کوردی)یمان، نەبووە.

ئەم دەلاقە گەورەیە، لە بواری فەرهەنگی نووسیندا، لەلایەن زانای مەزنی گەلەکەمانەوە، شێخ محەمەدی خاڵەوە پڕکراوەتەوە.

خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵ، بەسێ(بەرگ) لە ساڵانی(1960، 1964، 1974)دا، فەرهەنگی (خاڵ)ی داناوە.

شێخی خاڵ، بەڕوونی لە سەرەتای فەرهەنگەکەیدا، ئەوەی دەرخستووە بۆ کورد کە ئامانجی لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا، چییە؟

بەڕێزی لەم بارەیەوە فەرموویەتی:(پێشکەش بێت بە پێشگاهی گەلی کورد، بەهەموو هۆز و تیرە وخێڵ و ئێڵ و بنەچەو ڕەگەز و نەتەوە و بەرەیەکییەوە، وە بە پیاوو ژن و کوڕ و کچ و گەورە و بچووك و خوێندەوارانی ئیمڕۆ و لاوانی پاشە ڕۆژ کە هیوای هەموو لایەکمانن، هیوادارم کە بەدڵێکی پاك و گیانێکی روونـاك و هەستێکی چاکەوە، ئەم فەرهەنگەم بەدیارییەکی نۆبەرە لێ وەربگرن.) خاڵ لە لاپەڕە(8-9)ی بەشی یەکەمدا، باسی گرنگیی زمان و فەرهەنگی بەم شێوەیە کردووە:(لەهەموو کەسێکەوە ئاشکرا

و نمایانە کە زمـان پایـەی هـەرە گـەورە و بـەهێزە لـە کۆشـکی کۆمەڵایـەتیدا، وە روشـتەی هـەر قـایم و بەتینـە بۆیـە یەکخسـتنی کۆمەڵـەو گـەل لـە رۆژهەڵاتییـەوە تـا رۆژئـاوای، بـەڵکو زبـان گیـانی گەلە، کە زیان بوو گەل هەیە کە نەشبوو گەل نییە.

هـەروەها ئاشـکرایە کـە سـەرمایەی زمـان خـەرمانی وتەیـە، وە گەنجینەکەشی فەرهـەنگی وشـەیە، هـەر بـەهۆی فەرهەنگەوەیـە کـە مەبەسـت لەوتـە دەرئەکـەوێ وە هـەموو وتارێکمـان نمایـان ئـەبێ، کەوابوو نووسـینی فەرهـەنگ بـۆ پاسـی زمـان و فەرهـەنگی نـەبێ، لەگەڵ گەلانا ناژمێررێ و ناناسرێ، بەڵکو ئەکرێ بە بەردەبازو پێ شێل لە ژێرپێی ئەو گەلانەی کە بۆ کوێستانی ژیان ئەچن. تا لەرێ پێڵگەدا پان وپلیش ئەکرێنەوە، وە لەگەڵ خاکا یەکسان ئەکرێن.

بەلاّم کە زمان و فەرهـەنگی بـوو، بـادیلیش بـێ، هـەر گەلـە، وە بەگەل ئەناسرێ وە رۆژێك ئەبێ کە لەگەڵ گەلانی خوا پێداوا رووە و کوێســتانی ژیــان بــرواو ســەرکەوێ، لــە پێــش کـــەوتن و بەرزبوونەوەدابێ– تا ئەگاتە لوتکەی هەرە بەرزی ژیان... هتد)

خاڵ لاپەرە(7–38)ی فەرهەنگەکەی بۆ پێشەکی تەرخان کردووە کـە تیایدا، نووسـەر دەربارەی قـەومی کـورد و گرنگـی زمـان و پـەیدابوونی خێزانـە زمانێکـان دواوە، گرنگـی فەرهـەنگ و پـەیدابوونی خسـتۆتەڕوو، بـەکورتیش دەربـارەی مێـژووی نووسـینی فەرهـــەنگ لـەکوردیدا، داوە. ئێمەش دەربارەی خاڵ و فەرهەنگ دانان بۆ کورد ئەڵێین:

1–شێخی خاڵ زانایانە لە فەرهـەنگ و ئـەرك و رۆڵـی لـە مێـژووی زمان و کەڵچەری میللەتان گەیشتووە.

2–فەرهـەنگی خاڵ، گەنجینەیـەکی پـڕ بـەهای وشـەکانی زمـانی کوردییەو بۆ یەکەمجارە کە کوردی بەکوردی لێك بدرێتەوە.

3–فەرهـەنگی خاڵ، بەری مانـدووبونی چەندەها سـاڵی تەمـەنی ئەو زاتە گەورەیەیە کە توانیوێتی بە هەوڵ و کۆششی یەجگار زۆر، سەدەها وشەی کوردی لە دەردی فەرامۆش کردن و لـە بیرچوونـەوە و فەوتان رزگاربکات.

4–فەرهـــەنگی خـاڵ، ئاوێنـــەی چەشـنی بیرکردنــەوە و جــۆری هەڵس وکەوت و لە جیهان و سروشت گەیشتنی میللەتی کوردە.

5–فەرهەنگی خاڵ، دیسـانەوە، ئاوێنەی چەشنی بیرکردنــەوەی مرۆڤی کورد و پەیوەندییە کۆمەڵایـەتێکانێتی کـە لـە دێرزەمانــەوە کورد خاوەنی بوون و بەردەوام لە گۆڕاندا بوون.

6–فەرهەنگی خاڵ، دەست نیشانکەری ئەو قۆناغە مێژوویانەیـە کە میللەتی کورد و زمانەکەی، تا ئەمڕۆ بڕیونی.

7–فەرهــەنگی خـاڵ، باشـترین سـەلمێنەرو نیشـاندەری پـەیوەندی میللەتانی دەوروپشتی کورد و زمانەوانەکانیانە بە زمانی کوردییەوە.

8–فەرهـەنگی خـاڵ، یەکـــەم فەرهەنگەکـــە تێکــڕای دیالێکتـــە کوردێکان بگرێتەوە.

9–فەرهەنگی خاڵ، بۆ یەکەمجار، بەشێوەیەکی زانستییانە وشـە هاووتاکانی خستۆتە ڕوو بۆمان.

10–فەرهەنگی خاڵ، لە خاڵبەندیدا، پەیرەوی ئەو دەستووورە باوانەی کردووە کە لەو سەردەمەدا لە عەرەبی و فارسیدا، بە کارهێنراون.

11–ئەگـەر هۆکـار و فاکتـەری سـەرەکی و بنچـی لای هندێکـان و عەرەبـە کـان لـە فەرهـەنگ دانانـدا، ئاینی و دینـی بووبێـت، ئـەوا لای زانـای مـەزنی گەلەکـەمان شێخ محەمـەدی خـاڵ، نەتـەوە پەرسـتی و کوردایـەتی بـووە. هیـچ کارێکیش، بێ کـەم و کوڕیـی نـابێت، بـەلاّم ئەگــەر فەرهـــەنگی خــاڵ لایەنــە چــاك و لەنگــەکانی بخرێنــە تــای تەرازووەوە، ئەوا بێگومان هەر بەلای چاکەکەدا دەشکێتەوە.

## پەندی پێشینان

بۆ ئەوەی لە پەندی پێشینان، بگەین، با هەرگوێ لە(خاڵ) خۆی بگرین کە لە لاپـەرە(7–12)ی سـەرەتایی چـاپی یەکـەمدا، فەرموویـەتی:(پـەندی پێشینان: فەلسەفەی ژیان و دەنگی تاقیکردنەوەی جیهان و بەری رەوان بێژی(بلاغـە) رەوان بێـژی(بلیغـان)ە کـە بـاوو باپـیران لـە هـەزاران سـاڵەوە بەکەلەپورێکی ویژەیی، بۆیان بەجێ هێشتووین، تا بیانکەین بە ئاوێنەی بالاّنما بۆ خۆمان.

پەندی پێشینان: بیرێکی جوان و پورتـەوێکی دەروونـە، هێنـدێ جار هەڵ ئەقوڵێ، لەدڵێکی ئاوەدانەوە، بۆ سەردەم و زبانێکی رەوان لـە کـاتی دوان، یـادوای روداوێـك کـە روویـدات، لـە پاشـا زۆر بـە خـێرایی دەمـاو دەم ئەکـــەوێ و بلاّوئەبێتـــەوە، وە پشتاوپشـت ئەگێڕیتەوە لە بەرجوانی و رێك و پێکی خـۆی، تـا نموونـەی ئـەو شتەی کە پەندەکەی تیا و تراوە، رووئەداتەوە، ئەوحەلـە خـاوەن مەبەسـت، پەندەکە ئەخوێنێتەوە، بۆ بەهێزکردنەوەی قسـەکەی، یـا رووناك کردنەوەی باسەکەی.

پەندی پێشینان: زادەی سروشتی ئادەمییە، لەبەر ئەوە لە ناو هەموو گەلێکا هەیە، وە بەهەموو زبانێك، وتراوە، وە زۆریان لە یەك ئەچن.

پـەندی پێشـینان: زادەی بیروبـاوەڕی گەلــە، وە دەسـت کـردی کۆمەلاًیە، بێ ئەوەی بزانرێ خاوەنەکەی کێیە.

پەندی پێشینان: بەرزی بیرو باوەڕی گـەل نیشـان ئـەدات لـە نـاو گەلانی ترا، وە ئەندازەی تێ گەیشتن بەرچاوئەخات، وە بە تـەواویی ئاشکراو نمایانی ئەکات، کە ئەو گەلە ئەندامێکی بەهۆش و بیرە، لـە جەسـتەی ئـادەمیدا، وە شایسـتەی ژیانـە، یـاخۆ ئـەندامێکی بـێ هۆش و گۆش و، شایستەی نەمانە.

پەندی پێشینان: وەك شتێکی زیندوو، هەمیشە لە زاوزێ دایە، وە هەریەکـەی لـە ناوچەیـەکا لـە دایـك بـووە، وە لــە بەسـەرهات و چۆنەتیـەکدا هاتۆتـە جیهانــەوە، لــە هــەژاریی، یادەوڵەمــەندیی، زەبوونــی، یادەســەلاّت و گــەورەیی، بــەندیی(عبودیــە)، یــاخود سەریی(استبداد) زۆر و ستەم، یا دادو پرسینەوە، ئەنجا کۆمەڵە لەو کاتانەدا، بێ پەروا، پەندێکیان لە دڵ و دەروونەوە هەڵ قولاّوە، بۆ سەردەم و زمان، سایابەدەم ئاهۆ هەناسەی سارد و قوڵپی گریانەوە وەیا بەدەم پێکەنین و بزە و زەردەخەنەوە.

شێخی خاڵ بەردەوامە لەسەر باسکردنی پەندی پێشینان و ئەفەرمووێت: پەندی پێشینانی هەموو گەلێک، سەر گوزشت و مێژوویەکی تایبەتی هەیە، ئەگەر بزانرێ کێ وتوویەتی، وەچۆن، وە بۆچی، وەکەی، وەلەکوێ وتراوە، ئەو حەلە زۆرشتی ئەو ماوەیە، دەرئەکەوێ لەبابەت کۆمەڵایەتی و زانین و ئاین و سیاسەت و ئابووریی و پیشەسازیی و رەوشت و خووەوە، وە ئەوپەندە، وەك ئاوێنەیەکی باڵانما، چۆنیەتی ئەو سەردەمەمان بۆ روون ئەکاتەوە، بەڵام داخەکەم، هێشتا کوردی قوربەسەر، ئەوەندە ماوەی نەبووە کە بەحەسیتەوە وە بیر لەشتی وابکاتەوە.)

ئا بەم شیوە زانستی و وردو قوڵییەوە(خاڵ) تیمان ئەگەیەنێت کە مەبەست، لە پەندی پێشینان، چیەو چۆن سەر هەڵئەدات و چ ناوەرۆکیکی هەیە و بوونی لە زمانی میللەتاندا، نیشانەی چیەو چۆن و چ رۆڵیك، ئەبینێت، لە دەولەمەندکردن و گەشەسەندنی کلتوور و روناکبیری و میشککردنەوە و باوەر بە خۆبوون و چەندەها بیر و بۆچوونی تر؟

لە راستیدا، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق، وەك بەشێك لەبەشەکانی فۆلکلۆری میللەتەکەمان، لەوانیتر خزمەتی زیاترکراوە (مەبەست لە چیرۆك و داستان و گۆرانی..)

کۆنترین کۆمەلەی کۆکراوە، ئەوەیە کە لە ساڵی1933، ئیسماعیل حەقی شاوەیس، بە ناوی(قسەی پیشینان)ەوە کوی کردونەتەوە، ژمارەی پەندەکانی کە مامۆستا شاوەیس لە کتیبەکەیدا چەسپاندوونی بریتیە لە(603)پەند.

مەعرووف جیاووك، لە(ساڵی1938)دا بەناوی(هەزار بیژوپەند)ەوە،(1000)هەزار پەندی پیشینانی کوردی لەسەر پەیرەوی تیپی هیجا کۆکردۆتەوە و لە چاپی داون. پیرەمیردی نەمریش، لە(ژیان و ژیانەوە و ژین)دا، زۆر پەند و قسەی نەستەقی خستۆتە قالبی شیعرەوە و بلاوی کردونەتەوە.

بەشیوەی کرمانجی ژووروش، گەلی کتیبی پەندی پیشینان، چاپکراوە، لەوانە:

جگەرخوین، ساڵی1957، لە شام، کۆمەلیکی چاپکردووە. جەمیل کەننە، ساڵی1957، بە ناوی(امثال كردية)، کۆمەلیك پەندی کوردی بەوەرگیرانیان بۆ عەرەبی، چاپکردووە.

کوردەکانی یەکیتی سۆڤیتی جاران، لەم مەیدانەدا رۆلی باشیان بینیوە و زانا و فۆلکلۆرناسە کوردەکانی ئەو وڵاتە، گەلیك- بە پەندی پیشینانەوە خەریك بوون، لەوانە: حاجی جوندی، جاسمی جەلیل، قەناتی کوردۆ، د.مارگریت رۆدینکۆ کە کۆمەلیك پەندی پیشینانی وەرگیراوەتە سەر زمانی روسی. د.عیزەددین مستەفا رەسوڵ، دەربارەی ئەو کتیب و کەسانەی کە پەندی پیشینانیان کۆکردۆتەوە ئەڵیت: (... لەمانە هەموو فروانتر و کۆکتر و هەمەرەنگتر، کۆمەلەکەی شیخ محەمەدی خالە، هەرچەندە ئەمیش بەپیی تیپی ئەبجەد ریزکراوە و دابەشکراوە، بەڵام لە فراوانیدا، پیش کۆمەلەکانی تر، ئەکەویت.) دیسانەوە، د.عیزەددین، هەر دەربارەی پەندی پیشینانی خاڵ ئەڵیت: (پەندی پیشینان هەروەك خۆی لەریزی فۆلکلۆردا، شتیکی تایبەتیە، هەروەها، لەگەڵ خۆیدا، بەشیکی تری فۆلکلۆر ئەهینیتە کایەوە کە ئەویش، کورتە چیرۆکە، چونکە هەموو پەندیك، سەرەتایەکی هەیە، واتە شتیك، قەوماویك، کارەساتیك، رووداویك رووی داوە، لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو پیاوە ژیرە، ئەو قسەیەی کردووە کە بووە بە پەند و مەسەل و بلاوبۆتەوە و ماوەتەوە.

نرخیکی گەورەی کۆمەلەی (پەندی پیشینان)ەکەی خاڵ، لەوەدایە کە زۆر بەدوای ئەم چیرۆکانەدا گەراوە و زۆری پەندەکانی بردۆتەوە سەر سەرچاوەکەی، هەرچەندە دۆزینەوەی سەرچاوە و چیرۆکی هەموو پەندیکی کوردی ئەرکیکی گرانە.)

شاکارەکەی خاڵ (پەندی پیشینان) سێ جار چاپکراوە:

یەکەم چاپ، 1957، (1311) پەندە.

دووەم چاپ، 1971، (3893) پەندە.

سییەم چاپ، 2000، (4513) پەندە.

پەندی پیشینان، لە رووی فۆرمەوە، چەند جۆریکە، جار هەیە رستە و وتەیەکی کورتە، وەك: بەندە بێ عەیب نابیت، ئاو بتبات لەپردی نامەرد مەدە.

لە شیوەی هۆنراوەدا:

**لەشەل هەڵ کەوتم خۆمدا بەکویردا**

**خوابەختی منی هەر لارو ویر دا**

**یان:**

**ئاوێ بروا بۆ روخانە**

**خۆیش بیخوا، نەك بیگانە**

**هەروەها**

**بەزستانان پینە و پەرۆ**

**بەهاوینان ورد ورد برۆ**

زۆرجاریش هەیە، پەندی پیشینان هۆنراوە نییە، بەڵام دوو بەشەو کۆتاییشیان، بە (سەجع)یکی یەك قافیە دیتەوە، وەك.

تەمەڵ ئەڵێ هەمووی ئەخۆم، دوایی ئەڵێ چیم کرد بەخۆم.

**ئەگەر زانیت ئەزم، ئەگەر نەتزانی دزم.**

**ئەگەر گۆشت گرانە، نەخواردنی هەرزانە.**

**حەوتی بمرێ لەباوان، سورمەی نابرێ لەچاوان.**

وەك مامۆستا (خاڵ) فەرموویەتی: پەندی پیشینانی زۆر گەل و میللەت لە ناوەرۆکدا، لەیەك ئەچن، هەر لەم بارەیەوە، گۆرکیش، ئەڵیت: (پەندی پیشینانش، وەك چیرۆك لە گەراندان، لەولاتیکەوە بۆ وڵاتیکی تر، لە میللەتیك و نەتەوەیەکەوە بۆ هی تر، لە ناو پەندە روسیکاندا، کۆمەلیك پەندی عەرەبی و یۆنانی و فارسی و مەنگۆلی و تەتەری و فینلەندی، بەدی ئەکرین.) ئیمە لیرەدا (2) دوو پەندی میللەتانی جیاواز، بەنموونەوە ئەهینینەوە کە لە ناوەرۆکدا، یا بە تەواوی یەکن، یا یەجگار نزیکن لەیەکەوە:

1–هەموو ریگایەک، ئەچیتەوە سەر رۆما (روس)

كل طريق اليك يا روما تعود.

(عەرەب)

هەموو ریگایەک، ئەچیتەوە بانە. (کورد)

زمان ئەوگەیەنیتی رۆما (ئەلەمان)

2–هەر کەسێ سمیلی سوور بوو، هەمزاغا نییە. (کورد)

هەر شتیک بریسکایەوە، زیر نییە. (روس)

هەندیک لەو پەندانەی کە (خاڵ) کۆی کردوونەتەوە، هی ناوچەی جیاواز جیاوازن، تیایاندا هەیە کە ناوەرۆکیان یەکە، بەڵام دارشتنیان، جیایە، وەک مارانگاز لە خشەی میروو ئەترسێ.// مارانگاز لە خشەی گوریس ئەلەرزێ.

چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.// چاکە بکە و بەئاویدادە.

ئاسنی سارد بەفوو نەرم نابیت.// ئاسنی سارد ئەکوتێ.

تاریکی مانگەشەو سەرلەئیوارە دیارە.// سەرمای زستان لە هەولەوە دیارە.

یەکیک، لە سوودە گەورەکانی کۆکردنەوەی ئەو پەندانە و چەسپاندن و رزگارکردن و نووسینیان، لەوەدایە کە بەهۆی جۆری ئەو وشانەی لییان داریژراوە، دەشێ سەردەمی پەیدابوونیان، یا هاتنە ناو زمانی کوردییان، با لەسەدا سەدیش نەبیت، بەڵام تارادەیەکی باش نزیک بکرینەوە و میژۆکانیان دەست نیشان بکرین، بۆ نموونە، ئەمانە چەند پەندیکی کوردیین کە وشەی بە ئەسڵ عەرەبییان تیدایە، دیارە هی سەردەمی جیاواز پاش بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزن و هەر بەم پەندانەدا کارتیکردنی زمانی عەرەبی بۆ سەر زمانی کوردی ئەلوێ هەستی پێ بکریت:

حەیا، قەترەیەکە کە تکا تکا..

بۆ پیاوی عاقڵ، ئیشارەتیک بەسە.

پیاوەتی بەسەر ئاوی حەمامەوە ئەکات.

بەسکی خالی ئاگربازی ناکریت.

باوکە بەڵایە، دایکە قەزایە، ژن نیعمەتی خوایە.

ئینسان وەک گا، هەر لە پیستیکا نابێ.

کورت و پوخت، ئەتوانم بەرامبەر بە (پەندی پیشینان)ەکەی خاڵ، بلیم:

1–بۆ یەکەمجارە ئەو ژمارە زۆرە کۆبکریتەوە.

2–وەک لە پیشەکی بەشی یەکەمدا، دەرئەکەویت، هۆی سەرەکی و فاکتەری هەرە گرنگ کە پالی بە شیخی خالەوە ناوە، بۆ ئەوەی ئەم هەنگاوە مەزنەش، لە تەک هەنگاوە ئەدەبیکانی تریدا، بنیت، هەستی بەرزی کوردایەتی بووە.

3–بەهۆی خالەوەیە کە ئەو هەموو پەندانەمان بۆ رزگارکراوە.

4–ماندووبوونەکەی خاڵ لە کۆکردنەوەی ئەو ژمارە زۆرەی پەندەکاندا لەوەشدایە کە بەناوچەیەکەوە نەوەستاوە، بەلکو پەل و پۆی بۆ زۆر ناوچەی کوردستان هاویشتووە.

5–دەرخستن و دەست خستنە سەر ئەسڵ و هۆی پەیدابوونی هەندێ پەند کە خاڵ بەستوونیتەوە بەو چیرۆکانەی کە ئەو پەندانە لە ئەنجامی ئەواندا هاتونەتە کایەوە، بایەخیکی تری کارە گەورەکەی خالە.

6–پەیوەندییە کۆمەلایەتیکان و چۆنیتی بیرکردنەوەی مرۆڤی کورد لە سروشت و دەوروبەری و باری گوزەران و فەلسەفەی ژیانی خەلکی لە سەردەمی جیاواز جیاوازی میژوودا، لە ریگای پەندەکانی خالەوە پەییان پێ ئەبەین و هەر ئەوانیش لەم رووەوە بوون بە ئاوینە بۆمان.

7–کتیبی پەندی پیشینانی خاڵ، بە جۆریک کتیبخانەی کوردی دەولەمەند کردووە کە دەشێ، ئەو کتیبە بە پیناسە: هەویی کورد دابنریت.

8–رزگارکردن و چەسپاندنی ئەو هەموو پەندە، زۆر لەبارە کە چەندەها لیکۆلینەوەی زمانەوانی بەراوردی میژوویی لەسەر بکرین.

کۆتایی قسەکانم بەم چەند وتەیە ئەهینم: هەستی بەرزی نەتەوەپەرستی و کوردایەتی بووە کە بالی بەو زانا ئاینییە گەورەیەوە ناوە کە فەرهەنگیکی بەزیرکیشراوو بێ هاوتا و ئاوا پربەها و مەزن و کتیبیکی بەنرخی وەک پەندی پیشینان و چەندەها بەرهەمی پلە بالا و بێ وینەی تریش، پیشکەش بە میللەتەکەی بکات.

میللەتی کوردیش، بێ‌سێ و دوو لیکردن، هەمیشە لە ریزی پیشەوەی زانایان و دلسۆزان و رووناکبیران و بلیمەتان و خەمخۆرانی خۆی دایئەنیت و بەو ئەرکە پیرۆز و ماندووبوونە دریژخایەنەی ئەو زاتە پاک و گەورەیەی زانیوە و بەوەفا ئەبیت بۆی.

هەزاران سلاو بۆ گیانی بیگەردی ئەو کەلە زانایەمان.

## تێبینی

بۆ نووسینی ئەم وتارە، جگە لە بەرهەمەکانی شیخ محەمەدی خاڵ، سوودم لەچەندەها سەرچاوەی تر بینیوە، بەتایبەتی:

1–پەندی پیشینان و قسەی نەستەقی روسی، بە سەرپەرشتی (ڤ.ک.سەکەلۆڤا)، مۆسکۆ، 1969. (بەروسی).

2–ف.م. بیریۆزین، میژووی لیکۆلینەوە زمانەوانیکان، مۆسکۆ، 1975. (بەروسی).

3–د.عیزەددین مستەفا رەسول، لیکۆلینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، 1970.

4–د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، بەغدا 1975.

## سەرچاوە

گۆڤاری گەلاویژی نوێ ژمارە (29)ی حوزەیرانی 2002.

# دەست نووسی کۆن و تازە و هێندێ لە نامەخانەکان

بەقەڵەمی ئەندامی کارا شێخ محمدی خاڵ

دوای ئەوەی کە ئادەمیی دروست بوو لەسەر زەویی هەزاران هەزار ساڵی بەسەرا تێپەڕیی نرخێکی وای نەبوو کە ناو ببرێ، وەك خوا ئەفەرموێ: "هل أتى على الانسان حين من الدهر لم يكن شيئا مذكورا" واتە بەڕاستیی ماوەیەکی ئێجگار زۆر تێپەڕیی بەسەر ئادەمییدا نرخێکی وای نەبوو کە ناو ببرێ، بەڵام بەدەستووری پەیدابوون و بەرزبوونەوە "نشوء وارتقا" بەرە بەرە سەرکەوت بەسەر پلەی شارستانێتیدا تا سەرکەوت بەسەر هەموو گیان لەبەرانێکی ترا.

بەڵێ دوو شت گەورەترین شۆڕشی هەڵگیرساند لەسەر زەویی، وە ئادەمیی جیاکردەوە لە هەموو گیان لەبەرانی تر. وە لەناو هەموویانا ئەمی لەسەر تەختی پاشایەتی دانا لەم جیهانەدا، یەکەم دەستی، دووهەم زمانی. کە دەستی بەرەڵڵا کرد بەم ڕەنگە بەرزی کردەوە لەزەویی لەکاتی ڕۆینا، سەد هەزاران هەزار شتی سەیری پێ دروست کرد، وە گەورەترین کەلەپووری بەجێ هێشت لەسەر زەویی.

کە زبانی بەرەڵڵا کرد، بەم ڕەنگە دەستی کرد بە قسەکردن، توانی هەرچی بەدڵیا بێ بیڵێ، وە هەموو کەسێك لەگەڵ هەموو کەسێکا قسە بکات و لەیەك بگەن، وە یارمەتی بیری یەکتریی بدەن، تا ئادەمیی گەیشت بەم پایە بەرزە کە هەرچی ئەمڕۆ ئەی بینیین لە دیمەنی شارستانێتی و زانیین و زانیاریی، هەمووی بەری کردەوەی دەست و زبانێتی.

بەڕاستی دۆزیینەوەی پیپت و ووشە و گوفت و گۆ کردن و دانانی ناو بۆ هەموو شتێك بەجۆرێك کە ناوی هەر شتێکت برد وەك ئەو شتە بێتە بەرچاو زۆر زۆر گرنگە، ئەگەر ڕاستت ئەوێ دۆزیینەوەی ئەمانە گەلێ گەلێ لە دۆزیینەوەی ئەتۆم ووردتر و هونەرتر و گرنگترە، بەڵام چونکە لەمناڵییەوە فێری بووین و هۆگری بووین بۆیە زۆر لێی سەرسام نابیین.

ئەوەندەی دۆزیینەوەی ئەمانەی کە ووتمان گرنگە ئەوەندەش نووسیین بۆ ئادەمیی گرنگ و بەکەڵکە، کە ئامڕۆ ڕۆژهەڵاتیی لە مەبەستی ڕۆژئاوایی، وە ڕۆژئاوایی لە مەبەستی ڕۆژهەڵاتیی ئەگەن، وە مەردومی ئەمڕۆ لە نووسینی هەزاران ساڵ لەمەوپێش تێ ئەگات.

بەڵێ دۆزیینەوەی نووسیین یەکەمین هۆ بوو بۆ تێ گەیاندنی ئادەمیی لە یەکتریی لە ئادەمەوە تا ئەمڕۆ، لەمەوە دەرکەوت ئەندازەی گرنگیی کتێب و نووسراو لەناو کۆمەڵەدا، وە ئەندازەی ئەو تیین و تەووژمەی کە کتێب و نووسین ئەیکەنە سەر هەستی ئادەمیی بە باشیی یا بە خراپی.

ئاشکرایە کە نووسیین تیین و تەووژمێکی ئێجگار زۆری هەیە لەسەر بیر و باوەڕ و هەست و ئارەزووی مەردوم. زۆر خاوەن قەڵەم بە هۆی نووسیینەوە سەرکەوتوون لە وەرگێڕانی ڕژێمی گەلان و گۆڕینی ژیانی کۆمەڵایەتی دا بەو جۆرەی کە خۆیان ویستوویانە، ئنجا سا یا بەباشی وە یا بەخراپی. امامی غەزالی- خوا لێی ڕازیی بێ- ئەمەی زانییوە فەرموویەتی: ڕەووشت و خووی بەرز لەسەرەتاوە هەر باوێکی دروست کراو بووە، بەزۆر مانەوەی ئەو باوە بوو بە سروشتێکی جێ گیر، لە پاشا ئەو سروشتە باوك و باپیر و دایك و داپیر بە کەلەپوور بەجێیان هێشتووە بۆ کوڕ و کوڕەزا و نەوە و وەچە و بەرەیان تا بووە بەشتێکی ناخیی و غەریزەیەکی جێ گیر.

لەم قسانە دەرکەوت کە ئەمڕۆ کتێب و نووسیین یەکەمیین هۆن بۆ پەروەردەکردنی گشتی، وە یەکەم هۆن بۆ بێدارکردنەوەی هۆش و هەست. ئنجا ئەگەر خواستی خوای لەسەر بوو ئەوا کۆمەڵێك لە خاوەن قەڵەمان ئەنێرێ بۆ گەلێك، وە ئەیانکات بە پێش ڕەویان، وە پێشیان ئەکەوون تا ئەیانبەن بۆ سەرچاوەی بەختیاریی و کامەرانیی لە هەردو جیهانا.

***

ئەمە تا ئێستا باس ی نووسیین بوو، ئنجا با بێینە سەر باسی کتێب و نامەخانەکان، ئەم نامەخانانە نامەخانەی تایبەتی بن، یا نامەخانەی گشتیی و تێکڕایی بن.

لە ڕۆژێکەوە ئادەمیی فێری نووسیین بووە حەزی لەوە کردووە کە زانیین و زانیاریی خۆی بنوسێ و بیخاتە سەر کاغەز، لەمەوە بییری نامەخانە پەیدابووە، وە دانە دانە کتێب کۆکراوەتەوە، وە لەناو گەلانی کۆنا بەرەبەرە کتێب زۆر بووە، وەك گەلی میسریی و هیندیی و چیینی، بەڵام بەتەواویی کەس نازانێ لەو سەرەتایەدا ژمارەی ئەو کتێبانە چەندە بوون و چی بوون، وە لە چ مێژوویەکا نوسراوون، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە کە کتێب لەناو ئەو گەلە کۆنانەدا زۆر پییرۆز بووە بە ڕەنگێك کە دروست نەبووە هەڵگرتنیان لە پەرستگا و جێی خواپەرستییدا نەبووبێ، لە پەرستگاکانی میسردا کتێب بوون کە باسیان کردووە لە بییر و باوەڕ و تەندروستی و کشت و کاڵ. مێژووشناسان باس ئەکەن کە "رمسیسی" گەورە- کە یەکێك بووە لەفیرعەونەکانی میسر- زۆر کتێبی کۆکردۆتەوە لە کۆشکی خۆیا، وە خستوونییە ژێر چاودێریی دوو خوای خۆیان: "تووت" و "سافرێن"، کەواتە هونەری دامەزراندنی نامەخانەی تایبەتی ئەچێتەوە بۆ میسرییەکان. بەڵام هونەری دامەزراندنی نامەخانەی گشتی و تێکڕایی ئەچێتەوە بۆ یۆنانییەکانی زۆر کۆن.

لەو نامەخانە گشتییە بەناوبانگە یۆنانییانە ئەو نامەخانەیەی کە پییرنمام

دایمەزراند لە کۆتایی سەدەی سێهەمی پێش زایندا "میلاد" کە لە پاشا گوێزرایەوە بۆ ئەسکەندریە، وە نیو ملیون دەست نووسی تیا بووە، هێندێ ناحەز وتوویانە: ئەم نامەخانەیە عەمری کوڕی عاص سووتاندی لە ساڵی 642 زایندا بە فەرمانی حەزرەتی عومەر، بەڵام وەك "رینان" و "جوستوف لیبون" و "بەتلەر" و گەلێکی تر لە خۆرشناسەکان پۆستکەندەیان کردووە، وە دائرة المعارفی بەریتانی و ئیسلامی لێی کۆڵییوەتەوە بەشێکی زۆری ئەو نامەخانەیە واتە چوار سەد هەزار جلدی 48ساڵ پێش زایین سووتاوە، وە بەشەکەی تریشی 252ساڵ پێش گرتنی ئەسکەندەرییە لەلایەن عەرەبەوە سووتاوە بەدەستی أسقف "تیوڤیلو"وە، وەك دوور و درێژ باسکراوە لە کتێبی "الفاروق عمر"ی محمد حسنين هيكل و "الفاروق عمر بن الخطاب"ی محمد رضادا.

لە رومیە لەزۆر کۆنەوە نامەخانەی زۆری تیا بووە، هەرچەند لەو سەردەمەدا کە ئەو نامەخانانە بوون وە زادەی ئەفکار نرخێکی وای نەبووە لە ناویانا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا نامەخانەی تایبەتی زۆر بووە، وە لەپاشا نامەخانەیەکی گشتیش لە رومیە پێکەوە نرا لە سەردەمی ئیمبراطور اغستوس، وە ناونرا بە نامەخانەی اوکتافیە. ئەم نامەخانانە لە ژێر چاودێری زانایانی رومانی و یۆنانی‌دا بوون، بەڵام بەداخەوە ئەم هەموو نامەخانانەی کە بەسەد هەزاران زێریان پێ درابوو هەمووی لەژێر پێی ئەو چەتە و پیاوکوژ و جانەوەرانەی کە هێرشیان بردە سەر رومیە لەناوچوو.

لەپاشا خۆشەویستیی کتێب لە رومیە بەرە بەرە دەستی پێ کرد تا سەر رێژی کرد بۆ هەموو شارەکانی تر، وە لەبەشی زۆری شارەکانیا نامەخانەیان تیاکرایەوە، لە پاشا بەرە بەرە ئارەزووی کۆکردنەوەی کتێب پەیدا بوو تا گەیشت بە پایەیەك هەر کۆشکێکی گەورە نامەخانەیەکی تیا نەبوایە ئەو کۆشکە نرخی نەبوو.

کە قرونی وسطی هاتە پێشەوە نامەخانە کۆنەکانی یۆنان و رۆمان بێناز کەوتن، وە پەرش و بڵاوبوونەوە شتێکی کەمیان نەبێ لە کتێبە گرنگەکان، لەو رۆژانەدا کەنیسەکان پیاوانە و مەردانە دەستیان گرت بەسەر ئەو کتێبانەی کەوا دەرچووبوون، وە لە لەناوچوون رزگاریان بوو بوو وە چاودێریان کردن، بەڵام بەداخەوە قەشەکان کە پەرەیەك یا چەند لاپەرەیەکیان لە کاغەز بویستایە بۆ نووسینی هێندێ شتی پروپووچی خۆیان، ئەهاتن چەند پەرەیەکیان لەو کتێبە بەنرخانە دەرئەهێنا، وە نووسیینەوە سەرەکێ‌کەیان ئەسرییەوە، وە ئەو شتەی کە خۆیان ئەیان ویست لێیان ئەنووسیی، بەم هۆیەوە بەنرخترین دەست نووسی کۆن نەما، یا ناتەواو، وە نییەو نیووە چڵ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشا ئەوی مایەوە لە کتێبی کۆنی بەنرخ هەر لە کەنیسەکانا بوو کە مایەوە.

کاتێك کە ئیمبراطور شارلمان هاتە پێشەوە لەسەدەی هەشتەمی زایندا ئارەزووی کۆکردنەوەی کتێب پەیدابوو لەناو گەلانی ئەوروپادا، وە کەم کەم نامەخانە پەیدا بوو لەدێر و کەنیسەکانا.

لەدوای سەدەی دەهەم ئەم ئارەزووی کتێب کۆکردنەوەیە زۆرتر بوو تا سەدەی پانزەهەم هات، وە وتوو وێژی دینی پەیدابوو لەناو "پرۆتستانت" و "کاثولیك"دا، وە بەم بۆنەیەوە کتێب زۆر بوو، لە پاشا رۆژی زانیین و زانیاریی لە هەموو لایەکەوە هەڵهات، وە لەسەدەی شانزەهەما چاپخانە پەیدا بوو، وە کتێب زۆربوو، وە ئارەزووی کتێب کۆکردنەوە بڵاوبووەوە لە ناوەندی پاشا و زانایانا، وە نامەخانەی گشتیی و تێکرایی کرایەوە لە هەموو شارێکا.

***

ئەمە تا ئێستا قسە لە نامەخانەکانی ئەوروپا و ئەوروپایی بوو، بەڵام قسە لەدەست نووسی مسڵمانان و نامەخانەکانی، وەك لە وێژەی عەرەبی‌دا ئەڵێ: "حدث عن البحر ولا حرج" واتە قسە بکە لە دەریای بێبن و بێ پایان و مەترسە.

کاتێك کە دەوڵەتی ئیسلام دروست بوو، هەر لەسەدەی یەکەمیا خوێندەوارانی بەرز و رۆشن بیرانیان هەستان و دەستیان دایە دەست نووس کۆکردنەوە لەگەڵ ئەوەی کە زۆر کەم بوو، وە بەدەگمەن دەست ئەکەوتن، چونکە دینی ئیسلام لەزۆر لاوە داوای زانیین و زانیاریی ئەکات، هەر وەك داوای نوێژ و رۆژوو ئەکات، بەڵکو زانیین و زانیاریی بەمانایەکی گشتی گێڕراوە بە تاقانە هۆیەك بۆ رزگاربوون لە تارییکیی و نادانی و گومرایی و چوونە ناو بییروباوەڕی راست و دروست و ژیانێکی بەرزی مرۆڤایەتی، هەروەك خوا ئەفەرموێ "قل هل يستوى الذين لايعلمون" وا بڵێ ئەی پێغەمبەر: ئەوانەی زانان لەگەڵ نادان چۆن ئەبن بەیەك، واتە هەرگیز نابن.

وە ئەفەرموێ: "وقل رب زدني علما" واتەی ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەی خوای من هەمیيشە زانیینم زۆرتر بکە.

وە ئەفەرموێ "يؤتي الحكمة من يشاء ومن يؤت الحكمة فقد اوتي خيرا كثيرا" واتە خوا زانیینی بۆ هەر کەسێك بوێ ئەیداتێ، وە هەرکەسێکی گەیاندە پلەی زانیین و زانیاریی ئەوە میهرەبانیەکی زۆری لەگەڵ ئەو کەسەدا کردووە.

بەڵکو زانیینی گێڕاوە بە مایەی تێ گەیشتن لە دیین ئەفەرموێ "وتلك الأمثال نضربها للناس وما يعلقها الا العالمون" واتە ئێمە ئەم هەموو نموونانەتان بۆ ئەهێنینەوە تا راستتان بۆ دەرکەوێت وە مەردومی دانا نەبێ کەسی تر تێیان ناگات.

بەهۆی ئەم ئایەتانە و گەلێکی تر لە نموونەی ئەم ئایەتانە ئیسلام زانیین و زانیاریی بڵاوکردەوە لەناو مسڵمانان، وە هەموو بەجارێك دەستیان دایە خوێندن و خوێندەواریی، وە دەستیان کرد بە گەڕان بە شوێن خوێندنا، وە سوورانەوە بە شوێن سەرچاوەی روونی زانیین و زانیاریی دا بەرەنگێك کە هەر لەسەدەی یەکەمی ئیسلاما زانیاریی کۆن و تازەیان کۆکردەوە لە زانیاریی هیند و فرس و روومانی و یونانی، وە دەستیان کرد بە وەرگێڕانی ئەو کتێبانەی کە ئەکەوتە ژێر دەستیانەوە لە کتێبی بێگانان.


سلێمانی
١٣٨٥/٥/٩
١٩٦٥/٨/٧
مامۆستای بەرز و بەڕێز دکتور د ورو گلیگیتی ئەندراس
لە پاش ناردن و ڕەوانە کردنی کاروانی سلام و احترام، کاغەزی
بەرز لە میژە بائیتان گەیشت، لە چاکیی وتەن دروستیتان کەیف
خۆش بووم، بەڵام زۆر سەرسام بووم کە باسی گەیشتنی ئەو کتێبە تاریخی
یەی تیا نەبوو کە بە دیاریی پێشکەشم کرد بوون، وە بە عەرەبی نووسیوم و
لە چاپم داوە لە ژیانی عالم و شاعری بەناوبانگ «شێخ معروفی نودێی»،
کە لەوێدا ترجمەی ژیانی «نالی» شی تیایە، زۆر ئەترسم کە فەوتابێ
بەڕاستی ئەگەر فەوتابێ زۆر جێی ئەسەفە.
لە بابەت دیوانی چاپکراوی «نالی» یەوە نووسیبووتان کە
نسخەیەکتان پێشکەش بکەم لە هەردوو چاپەکەی، زۆر متأسفم کە نسخەی
چاپکراوی «نالی» م نییە بە هیچ چاپێکیان، هەروا لە مکتبەکانی سلێمانی
نەماوون، ئەگینا زۆر بە ممنونی هەردوکیانم پێشکەش ئەکردن، بەڵام
لەمەولا هەوڵ ئەدەم کە بۆتان پەیدا بکەم وە بۆتان بنێرم.
ئیتر بەم بۆنەیەوە احتراماتم تقدیم ئەکەم
المخلص
محمدی خال
قاضی سلیمانی

قـاضي القضـاتي حيـدر ئابـاد لــه ووتارێکی خۆیا به ئینگلیزیی نووسییوێتی و مجلەی مقتطفی میسری وەری گێڕاوە بە عەرەبی، لە کۆتایی ووتارەکەیا ئەڵێ هەر لەسەدەی یەکەمی ئیسلامەوە دەست کرا بە کتێب کۆکردنـەوە تـا دەمـی ئـەبی جعفری منصور، وە ئەم ئەبو جعفرە فەرمانی دا بە وەرگـێڕانی کتێبـی فارسـی و یۆنـانی تـا دەوری هـارون الرشید کتێب زۆر بوو، چ لە وەرگێڕاوەکان و چ لە دانراوەکان، لەبەرئەوە هـارون الرشـید کۆشـکێکی زۆر گـەورە و فراوانـی دروست کـرد بـە نـاوی "بیـت الحکمة"وە، وە هـەرچی کتێبێـک بـوو لـە بغدادا لەوێ دایان نـا، وە ئـەو کتێبانـە بـە فارسیی و یۆنانی و قبطی و سـریانی بـوون، وە یحـی‌ی کـوڕی خـالدی بەرمـەکی سەرۆکی ئەو ڕاپەڕیینە بوو.

دوای هارون الرشید مأمونی کوڕی هاتە جێ‌ی وە زۆر حەزی لە کتێب بوو، تەنانەت ئەڵێن جارێکیان باری سەد حوشتری کتێب هێنـا بـۆ بغـدا، وە یـەکێک لـە مەرجـەکانی ئاشت بوونەوەی لەگەڵ ئیمبراطور مێشێلی سێهەمدا ئەوە بووە کە یەکێك لە نامەخانە گەورەکانی قسطنطينيەی بداتێ، کەبێجگـە لـە هـەزاران کتێبی بطلیموسی تیا بووە لـە ریازیـاتی ئاسمـانی‌دا، خـێرا مـأمون داوای وەرگێڕانی ئەو کتێبانەی کرد بـە عـەرەبی، لەم نامەخانەیەدا دوو گۆی زەویی تیا بوو، یەکێکیان لە زیبو و ئەویتریان لە بڕۆنز، کە ئەڵێن یەکەمیان بطلیموسی فەلەکیی خۆی بۆ خـۆی دروسـت کـردووە، وە سـێ هـەزار لیرەی ئاڵتونی یۆنانی تێچووە.

دوای مـأمون ئیـتر دەسـتکرا بـە کتێـب وەرگـێڕان و نووسـیین و دەسـتنووس کۆکردنـەوە، تەنانـەت ئەگێڕنـەوە ئەڵێن:(الواثـق بـالله) هـەموو مـانگێك سـێی هەزار دیناری ئەدا بۆ وەرگێڕانی کتێب.

لـەم سـەردەمەدا زۆر گرنگیـی ئـەدرا بـە خەتخۆشـیی و جزوبـەندی کتێـب. لـە خەتخۆشەکان یەکەمیان ابن البواب و دووهەمیان ابن مقلەی وەزیری المقتدر بالله بووە.

خۆلاسە هـەر لـە سـەرەتای خەلافـەتی عباسی‌یەوە ئـەوەندە کتێـب و دەستنووس زۆر بوو ناچار"ابو محمد بن اسحاق الـوراق البغـدادی المعروف بـابن اسـحاق الندیـم" کتێبی فهرستی دانا لە ساڵی277 کۆچی دا، واتە 1120 ساڵ لەمـەوپێش بـەهۆی کتێبـی فهرستەوە کتێب ئەناسراو ئەدۆزرایەوە.

امـامی ثعـالبی ئەفـەرموێ لـەدوای عباسیەکان هیـچ ئـەمیرێك لـە ئـەمیرەکانی بـەغدا نامەخانـەی نـەبووە بەوێنـەی سـیف الدولە، ئەو سیف الدولەیەی کە ئەبو نصری فـارابی نزییـك خسـتەوە لـە خـۆی، وە مانگانەی بۆ بڕییەوە تا کۆچی دوایی کرد.

ئـەبو الفرجـی اصفـهانی پـەنجا سـاڵ خـەریکی نووسینی کتێبی أغانی بوو، لە کۆتـایی‌دا کـە تـەواوی کـرد نسـخەیەکی نووسی‌یەوە، وە بەدیاریی بردی بـۆ سـیف الدولة ئەویش هـەزار لیرەی زێڕی دایـە، وە زۆر عوزریشی بۆ هێنایەوە کە ئەمڕۆ لـەوە زیاتر لەدەستیا نی‌یە.

لەدوای ئەوەی کە خەلافەتی عباسی ڕووی کردە نـەمان، وەك ملوك الطوائف پـەیدا بوون، دەوڵەتی بنوسامان لە بخارا و، بنو حمدان لە شام و، بنو بویە لە شیراز و، فاطمی‌یەکان لە میسـر پـەیدا بـوون، وە ئـەم دەوڵەتـە سەربەخۆیانە دەستیان دایە کتێب کۆکردنـەوە و پێـك هێنـانی نامەخانـە و بەرزکردنـەوەی پایـەی زانیـاریی، وە سـلطانی بخـارا نوحـی کـوڕی منصـور نامەخانەیـەکی زۆر گـەورەی پێکـەوەنا، ابـن سـینا ئـەڵێ چوومـە نـاو ئـەو

نامەخانەیە بێنیبیم نامەخانەیەکە نموونەی لە جیهانا نییە، بە هەزاران کتێبی وای تیایە کە نە ناوی بیستراوە و نە لە هیچ نامەخانەیەکی ترا بیینراوە.

هەر ئەم پاشای بخارایە "صاحبی کوڕی عباد"ی کرد بە وەزیری خۆی بەڵام ڕازی نەبوو بە وەزیریی وە بیانوەکەی ئەوەبوو کە ناتوانێ ماڵەکەی بگوێزێتەوە بۆ بخارا چونکە هەر لە کتێب چوارسەد باری حوشتر کتێبی دەست نووسی هەیە.

مێژوو نووسەکان ئەڵێن نامەخانەی قصر لە قاهیرە گەورەترین نامەخانە بوو لە جیهانی ئیسلامی‌دا، وە ئەڵێن ملیۆنێك و شەش سەد هەزار دەست نووسی تیابووە، وە لەو نامەخانەیەدا هەزار و دووسەد نسخە مێژووی طبری تیا بووە.

اسپانیا دوای ئەوەی کە بوو بە دەوڵەتێکی ئیسلامی سەد ساڵی بەسەرا تێنەپەڕیی حەفتا نامەخانەی گشتی تیا کرایەوە کە یەکێکیان نامەخانەی قورطبە بووە، کە چوارسەد هەزار دەست نووسی تیا بووە.

خولاسە جیهانی ئیسلام وەك دەریای هادیی شەپۆلی داوە بەزانین و زانیاریی و بەنامەخانە و دەست نووس، وە بەهەزاران نموونەی "کندی" و "فارابی" و "بیرونی" و "ابن سینا" و "غزالی" و "ابن باجە" و "ابن طفیل" و "ابن رشد" و "ابن خلدون" و "ابن العربی" و "ابن مسکویهی" تیا بووە کە بەنووسیین و بلاوکردنەوەی زانیین و زانیارییەوە خەریك بوون، بەڵام بەداخەوە بەهۆی فتنە و فسادی سیاسیی و جەنگ و ئاژاوەی ناوخۆوە هەزاران نامەخانەی تایبەتی و تێکرایی، وە بە ملیۆنەها دەست نووسی عەنتیکە لە هەموو زانیین و هونەرێکا سووتا و لەناوچوو، وە سێبەری زانیین و زانیاریی دوورکەوتەوە لە جیهانی ئیسلام. ئەگەر هێرشی مغول نەبوایە کە وەك بای سەرسەڕ و لافاوی نەگبەتیی لە ناوەختا هات بەسەر جیهانی ئیسلامی‌دا- ئێستا بەهەزاران نامەخانەی دەست نووس ئەما بۆ ئەمڕۆ. مغۆل کە سەمەرقەند و بخارای گرت وێرانی کرد، وە قوتابخانەی مسعودبەگ لە بخارا- کە گەورەترین قوتابخانە بووە کوڕی هەلاکۆ لە ساڵی 671 کۆچی دا ئاگری تێبەردا، وە گەورەترین نامەخانەی لەو ڕۆژەدا سووتاند. ابن بطوطە ئەڵێ: تەتار کە عێراقی گرت بیست و چوار هەزار زانای گەورەی کوشت، دوانیان نەبێ کەسیان دەرنەچوو، وە بەهەزاران نامەخانەی دەست نووسی خستە دەجلەوە.

***

ئنجا با بێینە سەر باسی نامەخانەکانی کورد و کوردستان، ئەوە ئاشکرایە کە کورد وەك هەموو گەلێکی تر خوێندن و نووسیینی بووە، وە خوێندەوار و شاعیر وێژەری بووە، نەخوازەلا دوای هاتنی ئیسلام تاهێرشی تەتەر و مغۆل.

بەلای منەوە لەسەرەتای ئیسلامەوە یەکەمین دیوان و نامەی کوردیی‌مان دیوانی باباتاهیری هەمەدانیی‌یە، کە هەزار ساڵ لەمەوپێش ووتراوە، بەڵکو یەکەمین بەردی سەر گۆشەیە لە کۆشکی وێژەی کوردیی‌دا، لەبەرئەوە دیوانی باباتاهیر کۆنترین و پیرۆزترین دیوانە لە هەموو کوردستانا، ئەم دیوانە تا ئەمڕۆ چەند جارێك لە ئێران چاپکراوە، بەڵام هەموو جارێك ئێرانیی‌یەکان گەلێك ووتەی کوردییان لێ کردووەبە فارسیی، وە لەگەڵ ئەوەشا هێشتا ئاهەنگی کوردیی‌یەکەی هەر ماوە.

بەردی دووهەم لە بناغەی کۆشکی وێژەی کوردیی مثلثاتی شێخی سعدیە(1) کە لەسەدەی حەوتەمی کۆچی‌دا، وتراووە، کە ئەم مثلثاتە سێ شیعر سێ شعرە، وە هەموو سێ شیعرێکی یەکەمیان فارسی و دووهەمیان عەرەبی و سێهەمیان کوردی هەورامی‌یە کە جاران لە داوێنی کلیاتی شێخی سعدی‌یەوە لەچاپ ئەدرا، وە هەموو جارێك ئێرانیی‌یەکان دەست کاریی‌یەکیان ئەکرد، بەڵام ئەمیش وەك دیوانەکەی باباتاهیر ئێستاش لە شێوەی کوردی دەرنەچووە. تکام لە برا لوڕەکانمان ئەوانەی کە لە وێژەی فارسی‌دا شارەزان دیوانەکەی باباتاهیر و مثلثاتی شێخی سعدیی ڕاست بکەنەوە و پاکی بکەنەوە لە هەموو دەست کاریی‌یەك، وە بەچاپکراویی بلاوی بکەنەوە.

لەدوای هێرشی تەتار و مغۆل، کوردستان بەتایبەتی شارەزوور کەوتە ژێر پێوە، شاری شارەزوور لەو ڕۆژەدا لە بناری شاخەکانی خورماڵەوە دایگرتووە تا عەربەت، وە گەورەترین شاری ئەو قەڵەمڕەوە بووە، بە هەزاران زانایانی بەرز و دانایان و شاعیران و نووسەرانی تیابووە.

یاقووتی حەمەویی لە معجم البلدان دا، جلدی پێنجەم. لاپەڕە "314" چاپی یەکەم دوای باسی شارەزوور باسێکی ئەوەندە جوانی زانایانی شارەزوور و دانایان و خوێندەوارانی بەرزی ئەکات، شایستەیە هەموو کوردێك بە ئاوی تەلا بینووسێتەوە، وە لە چوارچێوەی زیوی بگرێ وە ڕووبەڕووی خۆی هەڵیواسێ. با بۆ ئاگاداریی لێرەدا چەند دێڕێکی لێ وەرگریین، معجم البلدان ئەڵێ:

"وقد خرج من هذه الناحية من الأجلة والكبراء والأئمة والعلماء وأعيان القضاة الفقهاء ما يفوق الحصر عده، ويعجز عن احصائه النفس ومده، وحسبك بالقضاة بني الشهرزوري جلالة قدر، وعظم بيت، وفخامة فعل و ذكر الذين ما علمت ان في الاسلام كله ولي من القضاة أكثر من عدتهم من بيتهم، وبنو عصرون أيضا قضاة بالشام وأعيان من فرق بين الحلال والحرام منهم وكثير غيرهم جدا من الفقهاء الشافعية، والمدارس منهم مملوءة".

ئەم عبارەتی معجم البلدانە ئەگەر بکەین بە ئاوێنەیەکەی بالانما و لێی ووردببینەوە تێ ئەگەین کە لەو ڕۆژەدا هەزاران زانایانی گەورە لە شاری شارەزوورا بوون، وە هەزاران نامەخانەی تیا بووە بە زبانی کوردیی و فارسیی و عەرەبی، بەڵام دوای ئەوەی کە هێرشی تەتار و مغۆل کرایە سەریان، وە هەرچی زانای بەرز و دانای گەورەیان بوو بەماڵ و منداڵەوە ڕەوییانکرد بۆ مووسڵ و سوریە و میسر، هەروەك

لەوەپێش تیرەی "جاوان" ڕەویان کرد لە شارەزوورەوە بۆ داوێنی عێراق، وە لەم هاتن و چوون و کشانەوەیەدا هەرچی نامەخانەی کوردستان و دیوانی شیعر و وێژە بوو هەمووی لەناوچوو. خولاسە نامەخانەکانی بغدا و هەموو جیهانی ئیسلامی چی بەسەرهات، نامەخانەکانی کوردستانیش وای بەسەرهات.

بەڵام لە سایەی طبعی ڕەوانی علی حریریی و، مەلای جزیریی و، علی تەرمووکی و، أحمدی خانی و، مەلا عبداللەی بیتوشی و، مەولانا خالدی نقشبندیی و، شێخ معروفی نۆدێیی و، بێسارانی و، مەولەویی و، مصطفی بەگی کوردیی و، نالیی و، سالم و، شێخ ڕەزا و، حاجی قادری کۆیی و، فایق و، مەحوی و، مەلا محمدی خاکی و، وە فایی و، أمین فیضی و، یمنیی و، مصباح و، مەلای جباریی و، سەیدیی و، ناریی و، مەلا صالحی حەرییق و، مەلا حەمدوون و، پیرەمێرد و، حمدیی و، تایەربەگ و، احمد مختار بەگ و، زێوەر و، بێخود و، شێخ سەلام و، بابارسوڵی بێدنی و، بابارسوڵی میری سوور و، هەردیی و، ئەسیریی و، گۆران و، قانع و، بێ کەس و، رمزیی معروف و، علی باپییر ئاغا و، شێخ نووریی و، شاهۆ و، هێمن و، دڵدار و گەلێکی




تـرەوە کەلێنی ساڵەهای ساڵمان پڕکراوەتەوە، وە لەم چل پەنجا ساڵی دواییی‌یەدا دیوانی زۆریان لەچاپدرا، وە نامەخانەکانی کوردستانیان ڕازاندەوە.

زۆر سوپاس بۆ خوا  کە زۆر کەشکۆڵ و بەیازی دەست نووس لە کوردەواریی دا هەن کە پڕن لە شیعری شاعیرانی کۆنی کورد وەك ئەختەر و، بیمار و، خەستە و، فتحی و، فکریی و، هجریی و، صافی و، مەجدیی و گەلێکی تر کە شیعرەکانیان لەسەر ڕووپەڕەی ئەو کەشکۆڵ و بەیازانە وەك ئەستێرەی ئاسمان ئەدرەوشێنەوە.

بێ گومانم زۆر دیوانی ترمان هەیە، وە زۆر کەشکۆڵ و بەیازمان هەیە کە شیعری سەدەها شاعیریان  تیا نوسراوە، ئەگەر لەم ڕووەوە هەوڵێك بدرێ زۆر شاعیری مردوومان زیندوو ئەبنەوە، وە دێنەوە ناومان و قسە و گوفت و گۆمان لەگەڵ ئەکەن، وە بەزادەی هەست و شیعرەکانیان زۆر ڕووپەڕەی ڕەنگیین ئەخوێنیینەوە، ئییتر پشت بەخوا.




## پەراوێز

(1 )شێخی سعدی کوردێکی جوانڕۆیی‌یە، مەلا محی الدینی مەلا جەلالی نوتشەیی لە ساڵی 1928 زایینی‌دا پێ ووتم: لە تاران لە نامەخانەی گشتی چاووم بە کتێبێك کەوت هەمووی بە شیعری هەورامی بوو، وە دەست خەتی شێخی سعدی وە دانراوی خۆی بوو، وە لە کۆتایی‌دا نوسرابو شێخی سعدی ناوی مصلح الدین کوڕی شێخ عبدالله، کوڕەزای شێخ حامدە، کە شێخ حامد خەڵقی "شامیان" هەورامانە، وە بە هۆی ناکۆکی هەورامانەوە چۆتە جوانڕۆ، وە سعدی لە جوانڕۆ لە ساڵی 569 کۆچی لەدایك بووە، لەدوایی دا "ئەتابگ بن سعد بنی زەنگی" بردوونی بۆ شیراز، وە سعدی لە تەمەنی 13ساڵیدا نامەی نوسیوە بۆ چەند هاوڕێیەکی لە جوانڕۆ سکاڵا ئەکات لە دوورکەوتنەوەی خۆی لەو نامەیەدا ئەڵێ:

دووگەشتم از قبیله عومری من بەربادشد
حرف ئەبجدرا شمارید 270شد

پییتەکانی ووتەی جوانڕۆ بە حسابی ئەبجەد ئەکاتە 270 سعدی لە ساڵی 691 کۆچی‌دا مردووە کە تەمەنی 120ساڵ بووە، وە باپییری شێخ حامد لە دێی دەگاشێخان لە هەورامان نێژراوە، وە خوابگاهی لەوێیە.

## سەرچاوە

دەستنوسی کۆن و تازە و هێندێ لە نامەکان، بەغداد–1986.



بغداد في ٢٩/شباط/١٩٦٠

إلى الأخ الاستاذ محمد الخال المحترم

بعد الهدية والتحية. ابارك صومكم وحبذا ان
يعيد شهر رمضان المبارك على جميع المسلمين
بالخير والبركة والرفاه والسعادة لجمهوريتنا الحبيبة
ثم اشكركم كثيرا على هديتكم القيمة القاموس
الكردي الكتاب الذي يدل عن بذلكم الجهد
لنيل المقصد بسد نقص بارز في مكتبتنا الكردية
التي اخذت تزدهر في عهد الجمهورية الزاهرة
وهذا ما يسجل فبارك الله من جهود واتعاب
من اقتراب اللهجات المختلفة. اخيرا وزير المعارف
ما تفضلتم به فوعدني بذلك واضاف تأملا
نأمل ان تتم الفائدة المرجوة من هذا القاموس
نقترح ان تضيفه قاموسا آخر في القاموس
بالعربي لتتم الفائدة لجميع الاخوان العرب
والاكراد هذا وتفضلوا بقبول فائق الاحترام

المخلص

خالد النقشبندي

# قسەی نەستەق و بەتوێکڵی مفتی زەهاوی

**خالّ**

مفتی زۆر قسەزان و قسە نەستەق وە قسە خۆش و نکتەباز بووە، لەسەر هیچ قسەیەك دانەماوە، وە گەلێ قسەی بە توێکڵی جوانی هەیە کە شایستەن بەئاوی تەلا بنوسرێنەوە.

ئەگێڕنەوە کە جارێك (داود پاشا) ناوێك بەگاڵتەوە لە مفتی پرسییوە کە بۆچی لەمزگەوت و مدرسەکانی ئێوەدا مثالتان لەعلمی نحودا هەر (ضرب زید عمرا)ە؟، هەمییشە بەزیدی زۆردار لەعمروی هەژار ئەدەن، وە عمرو ئەبێ چەسووچ و گوناحێکی ببێ؟، مفتیش کوتوپڕ ئەڵێ: پاشا، چونکە دزە، نابینین (و)ێکی لە ناوی ابوە دزییوە(2)، داود پاشا قسەکەی زۆرپێ جوان، وە ایجگار لای خۆش ئەبێ.

دووبارە ئەگێڕنەوە کە جارێکیان مفتی باسی شاعری بەناوبانگ: (بیدل)، وە تعریفی شعری ئەکات، چەند شاعرێکی بغدائی لێ ی ئەپرسن بیدل معنای چی یە؟ مفتیش ئەڵێ: یعنی (عدیم القلب)، ئەوانیش ئەڵێن یەکێ کە دڵی نەبێ ئەبێ شعرەکانی چیبێ؟ مفتیش ئەڵێ: (لایعرف عدیم القلب الا من لە قلب او القی السمع وهو شهید) یعنی معنای شعری بێدڵ نازانی ژیرێکی خاوەن دڵ، یا گوێ گرێکی تێ گەیشتو نەبی.

دیسان ئەگێڕنەوە کە جارێك لای مفتی باسی قسەخۆشی حاجی مـلا عبداللـەی کۆیە ئەکرێت، مفتیش ئەڵێ: گوێم بۆ قسە خۆشەکانی کاکە عبدالله خێل بووە.

هەمیسان ئەگێڕنەوە: کەڕۆژێ مفتی لە ماڵەوە نێرگەلە ئەکێشێ، ابراهیمی کوڕەزای منال ئەبێ لەنێرگەلەکە ئەکەوێ و بەسەریا ئەڕژێ مفتیش کوتوپڕ راست ئەبێتەوە و پەلاماری منالەکە ئەدا و ئەڵێ:- (یا نار کونی بردا و سلاما علی ابراهیم(3)) یعنی ئاگرەکە سارد بەرەوە و ابراهیم مەسوتێنە.

هەروەها ئەگێڕنەوە کە ڕۆژێ لەدەمی نیوەڕۆدا مفتی ئەچێ بۆلای والی، والیش بانگ ئەکاتە قاوەچی‌یەکەی، ئەڵێ: (جیب قهوە) واتە قاوە بێنە، مفتیش تومەز برسی‌یەتی، وە آرەزوی قاوەڵتی ئەبێ، نەك قاوە، ئەڵێ: (بدلها بالتی هی احسن) یعنی قهوەکە بگۆڕە بەشتێکی باشتری خۆشتر کە (قهوالتی‌یە)، یا (ە)ی آخری (قهوە) بکە بە (التی) ئەو حەلە ئەبێ بەقهوالتی .

زرجار مفتی لەگەڵ ماڵ و منالی خۆیا قسەی بە توێکڵی وای کردوە، کە ئەگونجێ هەر تێشی نەگەیشتبن، لە باپیرمم بیستووە ئەی فەرموو: ڕۆژی جەڕەیێکی گڵینی ئاو بەدەست کچە بچکۆلەکانیەوە ئەشکێ، لەسەر ئەمە دایکیان لێیان ئەدا ئەوانیش ئەگرین، مفتیش بانگ ئەکاتە ژنەکەی ئەڵێ: (کچێ! لێیان مەدە ئەوانە جمعی مؤنثی سالمن جەڕەیان بەکەسرەیە)

بەپێی دەستوری علمی نحو جمعی مؤنثی سالم وەك (معلمات) بوری بە بورو سەر و ژێری بەژێر ئەبێ، جاعبارەتەکەی مفتی هەروەك ئەمە ئەگەیەنێت، ئەمەش ئەگەیەنێت کە ئەم منالانە کچن، جەڕە و گۆزەیان بەدەستەوە ئەشکێ کەواتە لێیان مەدەن.

دیسان ئەگێڕنەوە هەمو جارێ کە أمجد افندی کوڕەزای بەمنالی چووەتە بەردەمی، مفتی پێ ی ووتووە: (تحب اباك امجد) واتە امجد! باوکت خۆش ئەوێ؟ . یاخو، باوکت خۆش ئەوێ یا باپیرت؟

هەمیسان ئەگێڕنەوە: کاتێ کە دوڵەتی تورك ئەیەوێ لە بغدا عسکر بگرێ، بەفییتی پیاوە گەورەکان، أهالی هەمو گەڕەکەکان کۆئەبنەوە و بەهەرا و هوریا هێرش ئەبەنە سەر سەرا، والی مدحت پاشا فەرمان ئەدا هەرچی پیاوە گەورەکانی بغدا ئەبێ لە سالونی سەرادا کۆیان ئەکەنەوە، وە لەبەرچاوی ئەوان فەرمان ئەدا کە پاپوڕیك بەدجلەدا سەرکەوێ، وە ئەوسالۆنەی کە پیاوە گەورەکانی تیایە بیداتە بەر تۆپ، گەورەکانی بغدا کە ئەمە ئەبیەن پەلەپەل هەریەك جواب ئەنێرێ بۆ دەستەی خۆی کەبلاوەی لێ بکەن، تا پاپوڕەکە ئەگاتە پێشەوە کەسێ لەنزیکی سەرا نامێنێ، والی کەئەمە ئەبینێ بەتورکی بەمفتی ئەڵێ: (زهاوی افندی! بغداد لیلر قرغەیە بگزەرلر، دانە گورد کارندە بردن طوپلانیرلر، فقط صاچمە گورد کارندە قاچارلر) واتە: زەهاوی افندی بغدائی‌یەکان وەك قەلەڕەش وانە کەدان ببینن بەجارێ لێ ی کۆ ئەبنەوە، بەلام کە ساچمەیان دی ئەفڕن.

زەهاویش کوتوپڕ ئەڵێ: (اما صاچمە) یعنی نەخوازەلا کە صاچمەکەش بەهێزبێ وەك ساچمەی ئەم تۆپە، یاخو: (صاچ مە) یعنی ئەم ساچمانە بەتۆپ بلاوی مەکەرەوە، یاخو، ئەمەی تۆ ئەی ئەڵێیت (صاچمە)یە، واتە قسەی پڕوپوچە.

لە امجد افندی زەهاویم بیست فەرموی: باپیرم هەرقسەییکی بکردایە بە تویکل بو، تەنانەت بوی گێرامەوە فەرمووی: لە پاش مردنی باپیرم بە چەند ساڵی(عادل)ی برام لە دایك بوو، وەمنیش چوم بومکتبی حقوقی ئەستەمول، لەوی گری بەکم هاتە پیش هەر چەندم ئەکرد رزگارم لێی نەئەبوو، شەوێك لە خەوما باپیرمم دی بانگی کردم(عادل) منیش ووتم قوربان من امجدم عادل نیم، وە لە خەوەکەم راپەرریم، زور سەرسام بوم کە باپیرم چون من بە عادل ئەزانی، لەگەڵ ئەمیشە کەمنی دیوە و عادلی نەدیوە لە پاشا ووتم ببێ و نەبێ ئەم قسەبەشی ئەبی بە تویکل بی، هاتم تەماشای ووتەی(عادل)م کرد لە فەرهەنگی عربی‌دا، کە ئەبینم(عادل) هاتووە بەفعلی امر لە(عادل یعادل)

بەمعنی لەسەرخویە، وە ووردبەرەوە، امجد افندی فەرموی: لەگەل ئەوەی کە لە لغتی عربی دا زۆر ئاگاداربووم ئەم معنایەم نەدەزانی تا ئەودەمە، وەتیگەیشتم مەبەستی باپیرم ئەمەیە لەو کارەی هاتووەتەپیشم وورد ببمەوە و لەسەر خوبم، ایترمنیش لە کارەکەدا تیبینیم کرد، تابە أسانی رزگارم بوو.

مفتی لە هیچ حەلیکا لەسەرقسە دانەماوە، بەلام خوی ئەلی: جاریکیان لە کولانیکی بغدادا تووشی عربیکی رووتەی ریش سپی بوم کەریکی دابووەپیش، بەتوانجەوە پیم ووت:(الی این یا أبا الحمار؟) یعنی بوکوی ئەچیت ئەی باوکی کەر، واتەئەی خاوەن کەر، ئەویش کوتوپرر ووتی:(الی السوق یا ولدی) یعنی بو بازاڕئەچم ئەی کوڕی خوم، مفتی ئەلی: جوابەکەیم ئەوەندە بەلاوە گورج و گول وجوان بووسەرم داخست ورویشتم(4).

## غیرەتی کوردایەتی مفتی

مفتی کوردیکی مەرد، و خوین گەرمیکی نەبەرد بووە، وە هەمیشە اگاداری کوردەکانی کردوە، هەر کامێکیان روزگاری ناهەموار ناچاری کردبی بە کوچ کردن و چوونە بغدا مفتی چاك دەستی گرتووە، وەلەلای والی یامشیر یا هەر کەسیکی تربوبی، تکای بوکردوە تادای مەزراندووە، لە کاتی مفتی داهەموو مدرسە گەورەکانی و مزگەوتە نایابەکانی بغدا بەدەست زانایانی کوردەوە بووە مفتی لە ناو مالومندالی خویا قسە و گوفتوگوی هەر بە کوردی بووە، وە وصیتیشی کردووە بونەوە و وەچەکانی کەلەدوای خوشی هەر بە کوردی قسە بکەن.

جمیل صدقی زەهاوی ئەی ووت: باوکم زور حەزی لەشعری شاعری نەخویندەواری کورد(علی بەردەشانی) کردووە، وە زور شعری ئەوی لەبەربوو، زستانان بەشەو دای ئەناین، شعری ئەوی بو ئەخویندینەوە.

مفتی هەر وەك دەستی کوردەکانی گرتووە، بەهەمو هیز و توانائی خویەوە پاسی ناوونیشانیشی کردوون، وە بە هەمورەنگی وە لە هەموشوینی لە سەریان هەلی داوەتی، وە غیرتی کوردایەتی هاتووەتەجوش و خروش.

ئەگیڕنەوە کە جاریکیان مفتی لەلای والی ئەبێت، وە لەناوەندی هەردوکیانا سەرینێك ئەبێت، لەوحەلەدا کوڕی حسن قولی خانی والی لوڕستان ئەچێتە لای والی وا دەرئەکەوێت کە والی لە قسەکانی خوشنوود نەبووە، لەپاش هەستانی کوڕەکەی حسن قولی خان، والی ئەمە فەراموش ئەکات کە مفتی کوردە، ئەڵێت: توخوا مفتی افندی! فرق چی‌یە لە بەینی کورد و کەرا؟ ئەمیش کوتوپڕ ئەڵێ: پاشا فرق لە بین یاندا ئەم سەرینەیە!. والی کەبیبری ئەکەوێتەوە مفتی کوردە زۆر شەرمەزار ئەبێت، وە داوای بەخشین و لێ بوردنی لێ ئەکات.

هەر لەسەر ئەمە مفتی ترکی هاتوچوی والی ئەکات، ڕۆژێك والی لە ڕوی گلیەییەوە ئەم آیتەی بۆ ئەنوسێت: (أستكبرت ام كنت من العالين؟) مفتیش لەداوێنی کاغدەکەیەوە بۆی ئەنوسێتەوە: (لاولا) مفتی بەدییمەن وەرامی والی ئەداتوە، بەڵام اشارە ئەکات بۆ ئەم نیوە شعرە کە ئەڵێت: (لااری القرد ولا القرد يراني).

دووبارە ئەگێڕنەوە کە جارێکیان لە بغدا لە کۆڕێکی گەورەدا باسی کوردە فەیلی‌یەکان ئەکرێت، کە گوایا هەمو کۆڵ کێشی ئەکەن، یەکێکیان ئەڵێت: (لولا الاكراد، لهلكت الحمير ببغداد) یعنی ئەگەر کوردەکان نەبن، کەری شاری بغدا هەمو ناوکەڕێژ ئەبن. ئەم قسەیە بەمفتی ئەگاتەوە ئەمیش کوتوپڕ ئەڵێت: (نعم نعم صدقوا، لولانا لهلكوا) یعنی بەڵێ بەڵێ ڕاست ئەکەن، ئەگەر ایمە نەبین ئەوان ناوکە ڕێژ ئەبن.

دیسان ئەگێڕنەوە کە أمین افندی ناوێکی کورد بووە لە بەغدا جارێك بەدەمیا هاتووە و ووتویەتی: من کوردنیم، مفتی کە ئەمە ئەبیستێت ئەڵێ: ڕاس ئەکا هەڵبەتە دایکی پێی ووتووە!.

**(شعر و شاعرێتی مفتی)**

مفتی ئەمەندەی زانا و پێشەوا بووە، ئەمەندەش بەسروشت شاعرێکی کوتوپڕیی بووە، لەزمانی کوردیی و فارسیی، تورکیی و عربی‌دا خاوەنی بیبری زۆربەرز، و شێوەی ڕەوان و، مەبەسی جوان و، معنای دور وقووڵە، هەروەك خۆی ئەڵێت:

لو بحسب الحسب المرء علا فوق معالي

كنت بالعلم وبالشعر على العالم عالي(5)

یعنی ئەگەر مەردوم بەوەجاخ زادەیی ژوور هەموو کەسێ بکەوێ، من بەزانایی و شاعریی ژوور هەموو کەسی ئەکەووم. بەڵام لەگەڵ ئەمییشە خۆی بەشعرەوە زۆر خەریك نەکردووە، ها ئەگەر هەلی هەڵ کەوتبێ، شعریك یا چەن شعریکی کوتوپڕیی تیا ووتووە، جالەبەر ئەمە مفتی ئەمەندەی بەزانایی ناوبانگی دەرکردووە، بەشاعری ناوبانگی دەرنەکردووە، تەنانەت قصائدیم نەدییوە، تەنها سیان نەبێ، یەکیکیان بە فارسی و ئەوانی تریان بە عربی، کەلەمەولا ئەیان نووسیین.

شاعری بەناوبانگ (معروف رصافی)ی کورد ووتوویەتی: ئەوەندەی من و(جمیل صدقی) زەهاویی بەشعرەوە خەرییکین ئەگەر مفتی زەهاویش نیوەی ئەوە بەشعرەوە خەرییك ببوایە، گەلی گەلی لە ئیمە شاعرتر وە شعری زۆرتر ئەبوو.

مفتی هەرچەندە بەشعرەوە خەریك نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەمەشا کە ووردئەبییتەوە لە شعرەکانیەوە، دەرئەکەوێ کە لەسەرچاوەیەکی روون و ڕەوانەوە هەڵ قولاوون، وە لە دەریایەکی زۆر قوولی گەورەی بی بنەوە هەڵ گیراوون، بەڵام -داخی بە جەرگم- ئەوشعرانەی کە بوویەتی کۆنەکراونەتەوە، وە هەر شعریکی کەوتووەتە لایەك، بێ گومانم هەزاران شعری مفتی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەبەری بووە و مردوون، کراوون بەژێر خاکەوە، وە چوونەتە پەردەی نەبوون، یاخو لە

کـون و قوژبنـی کتێـب خانــەکانا ماونەتـەوە تـا بـزن ئـەیان خـوا، یـا دڵۆپە لەناویان ئەبا، یا ئاگریان پێ ئەکرێتەوە.

بیستم کـە لـە کتێـب خانەکـەی محامی (مامۆستا عباس عزاوی)دا سێ قصیدەی فارسیی زۆر بـەرزی مفتی هەیە، کە یەکێکیان بەبۆنـەی هاتنی (ناصر الدین شا)وە بۆ بەغدا ووتویـەتی، دوانەکـەی تریشی هـەر یەکــەی بەبۆنەیەکــەوە ووتــووە. بەتایـبـەتیی لـە ســالی (1947م)دا چووم بۆ بغدا بـۆ لای، هـەر چـەند داوای قصیدەکـانم لێ کـرد نــەیدا، وە بەهانەیەکی هێنایەوە، دوای ئەو جارە دوو سفری تر کـە چوومـەوە بۆ بغدا، بەتایـبـەتیی چوومـە لای، وە تکـــام لێ کـــرد کــە، رێ بـــدا وێنەیــەکی قصیدەکـان بگرمـــەوە، بـەلام تکاکــەم بــەهیچ دەرچـــوو، ئەتوانم بڵێم ئەمە پێنج ساڵە چاپی ئەم کتێبەم دوواخستووە بەتـەمای ئەو قصیدانە، تابێ هیوا بووم لێی، خولاصە ئێجگار زۆرم هەوڵ داوە تا ئــەم چــەند شــعرانەی مفتیــم کۆکردووەتەوە.

مفتی لە گـەلێ بابەتـەوە شعری هەیە، لە ستایش "مناجاة"، تاك و تـەنیایی خـوا "توحیـد" فلســفە، سکالا لەدەست ڕۆژگار، لەگەڵ پەند و ئامۆژگــاریی، دڵداریـی، شــعری نەســتەق و بــەتوێکڵ، لاواندنــەوە "رثاء"، ذم، شعری تقریظ، مەتـەڵ، شـعری بەڕاگـەندە، کــە هەریەکــە بەبۆنــەی شــتێکی تایبەتی‌یـــەوە ووتوویەتی.

**شعری ستایشی:**

لەستایشــی مفتی‌یـــە ئـــەم دو شعرە عربیی‌یەی:

یارب حارت في ثناك عقول

ماذا عسى فيك العقول تقول

إن الوجود ثنى عليك بأسره

فثناء أهل الفضل فيك فصول(6)

یعنی خوایـە! هـەرچی ژیـیریی "عقـل" هەیـە لەستایشتاسەرسامە، نازانـێ چـی بلێـت، جیـهان بەجارێك ستایشت ئەكات، ایتر ستایشت لەلایەن زانایانەوە بێ هوودەیە.

هەر لە ستایشتی ئەم دو شعرە فارسی‌یەی:

جزاز توکس نکند دردرا دوا

غیراز توکس ندهد حاجتی روا

خواهیم حاجت خوداز تونەز ماسوی

بامادر احتیاج بودماسوی سوا(7)

یعنی خوایە! تۆ نەبی كەس دەردێك دەرمان ناكات، وەتۆنەبیی كەس نامان گووریی‌یەك لانابات، خوایە! پێویسـتیی خـۆم هـەر لـەتۆ داوا ئەکـەم، چونکـە بێجگـە لـە تـۆ هـەموو کەسـی وەك مـن چاوەڕووانی دەستی تۆن.

هەر لەستایشتی ئەم شعرە فارسی‌یەی:

حسن یەکی جلوە برون از شمار

بحریکی موج هزاران هزار (8)

یعنی جوانیی یەکێکە وەلێ نمایش و جلوە لەژمارەدا نیە، چونکە لـە هـەموو شتێ کدا جلوە و نمایشێکی خوای تیا نمایایە، دەریای زانیین یەکێکە بەلام شەپۆلی هەزاران هەزارە.

شعری تاکو تەنیایی خوای:

لەشعری مفتی‌یە لە تاك و تەنیایی خوادا ئەم دوو شعرە فارسی‌یەی:

تاچند زغیر جویم اسرار نهان

تاکی بحوالیی دلیل و برهان؟

شمس است دلیل شمس تابان تابان

ای دوست بیامر ازبرهان برهان(9)

یعنی تاکەی لەم و لەو داوای دەرخستنی نهێنی خوابکەم؟، وە بەدەوروپشتی بەڵگە و نیشانەدا بسووڕێمەوە بۆی؟، چونکە ڕۆژ هەر خۆی نیشانەی خۆیەتیی، کەواتە خوایە! ڕزگارم کە لە جوست و جوی بەڵگە و نیشانەت.

هەر لە تاك و تەنیایی خوایەتی ئەم دو شعرە فارسی‌یەی :

زدرکت حضرت ذاتش عقول محجوبند

سرادتات جمال و جلال گشتە حجاب

خیال و وهم تك و پومیرا زدندوبسی

بهیچ وجە نبردند رە بصوب صواب

یعنی لـە دۆزیینـەوەی ذاتـی خـوادا هـەموو ژیـیرێك چـاوی بەسـتراوەتەوە، پـەردەی جوانیـی و گـەورەیی ئەو بـوو بـە دییـوار لـە نـاوەندی خـوا و بەندەكانیا، یـاد و بییر لـەڕێی دۆزینـەوەی ئـەودا زۆریان هەڵمەت بردو خۆ کوتا، بەلام بەهیچ ڕەنگێك پەی‌یان بەذاتی ئەو نەبرد.

**شعری فلسفەی:**

مفتی گـەلێ شعری هەیـە لەبابـەت فلسفەی ژیـین و گونـاح و هێنـدێ شـتی تـرەوە، زۆر جـوان و شایستەن کە لەدوای شعری ستایش و تاك و تەنیایی خواوەوەی بنوسرێن.

مفتـی لـەپاش ئـەوەی کـە لـە بغـدا ناسـراو دامـەزرا، وە بـوو بەمدرسـی رسمـی، انجـا بـەرئیس المدرسین، انجا بەمفتی بغدا، وە بوو بەهاوشانی والیی و مشیر، وە معاشێکی زۆری بۆ بڕایـەوە، ایتر کەوتـە خۆشیی‌یەوە، وە شاهانە رای بووارد‌ووە، بەلام لەپاش ئـەوەی کـە پییر بـووە و عمـری گەیشتووەتە نـەوەد، وە آرەزووی دنیـایی کـەم بـووە، ڕۆژێـك تەماشـای ئاوێنـە ئـەکا، وە خـۆی بـە

پیـــاوێکی پیـــیری ایفتـــادەی تێقوپاوی ریـیش سپی دێتـەپێش چـاو، وە بــەم بونەیـــەوە بــیرێك ئەکاتـــەوە لـــەژیینی رابـــووردوی خۆی، هەروەك شریتێکی سیینەما کـە بـەپێش چاویـا رۆییبـێ، یـا خـــەوێکی دی بـــێ وائـــەزانێ، وە تاسێکی بەسـەرادێ وە لـەو تـاس بردنەوەیـــەدا ئـــەم چـــوار شـــعرە عربیـیە ئەڵێ:

بان لي في المرات شيخ كبير
عاش حتى تعرف الاحوالا
قلت كم عشت قال تسعين عاما
قلت ماذا فعلت فيها فقالا
اكلات دفعتها فضلات
وشروبا أرقتها ابوالا
وثيابا لبستها فاخرات
جددا قد نزعتها اسمالا(10)

یعنی لە ئاوێنـەدا پیرێکی کۆنە ساڵی وام دیی کە ئەوەندە ژیـابوو تا لـە هـەموو شت گەیشـتبوو، پێـم ووت عمرت چەندە؟ ووتـی: نـەوەد سـاڵ، ووتم:چیـت تیـا کـردووە؟، ووتـی: چـەن جـارێك خـواردن و خواردنـــەوە کـــەدام ناوەتـــەوە، وە چەن کاڵایەك کـە بـەتازەیی لەبـەرم کـــــــردوون و بـــــــەکۆنی دام کەندوونەتەوە.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم رباعی‌یە فارسی‌یەی:

چون بخارد پشت من انگشت من
خم شود از بارمنت پشت من
همتی کن تانخارم پشت خویش
وارهم از منت انگشت من(11)

یعنـی کاتـێ پشـتم بخورێنـم بـە پەنجـەی خـۆم، پشـتم کـۆم ئەبێتـەوە لـەژێر بـاری منتـی پەنجـەما، خوایـە! یارییدەیـــەکی وام بـــدە کـــە پشـــتم نەخورێنم، تارزگار ببم لە منتی پەنجەم.

هـەر لـە فلسفیەتی ئـەم رباعی‌یـە فارسی‌یەی:

چون علت رعشه شد نمایان درتر،
نزدیك بود جدایی جان زبدن
هرگا بشود زلزله اندر خانه
تعجیل کند خانەنشین در رفتن(12)

یعمی مەردوم کە لەبەر پییریی ئەندامی هاتە لەرزیین، ایتر کاتی مردن و گیان جیابوونەوەیـەتی، چونکە بوومەلەرزە، کە کەوتە خانوویەکەوە، دانیشتووەکانی خێرا دەرئەچن.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم رباعی‌یە فارسی‌یەی:

تابود خرد همیشه بودم محزون
رستم زغمم وغسه دوران بجنون
اینست علاج قطع حزن واکدار
ناآنچه بگفت ارسطو وافلاطون

یعنی تاژییر بووم هەمیشە دڵ تەنگ بووم، لەسایەی شێتی‌یەوە رزگار بووم لە خەفەتی ڕۆژگار، بەڕاستی هەر شێتی‌یە دەرمانی هەموو خەفەت و دڵ تەنگی‌یەك، نەوەك زانیین و پـەی ڕەویـی قسـەی أفلاطون و ارسطو.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم رباعی‌یە فارسی‌یەی:

هرکس شده مبتلا بسکر غفلات
زین سکر اناقه نبود تاعرصات
وان وقت بودتنگ و نباشد فرصت
تا آنچه بود تلافیات مانات

یعنی هەرکەسێ دووچاری سەرخۆشیی و بێ ئاگایی ببێ، لـەو سەرخۆشیی‌یە رزگاری نابێ تا ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژەش زۆر تەنگ و چەڵەمەیە، کەسێ ناتوانێ قەرەبووی رابووردوی تیا بکاتەوە.

هەر لەفلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

خطا برماست لازم ناشود غفاریش ظاهر
جزا اعدام من باشد گناه بی گناهیرا(13)

یعنی پێویستە گوناح بکەم، تا چاوپۆشیی و میهرەبانی خوا دەرکـەوێ، گوناحی ئەوانـەی کە گوناح ناکەن مردن و چوونەوەیانە بۆ پـەردەی نـەبوون، واتـە فریشتەو گیانداری بـێ زمان بۆیـە لـە ڕۆژی دوایی‌دا وەك ئادەمی زاد لە ایجگاری نامێننەوە چونکە بێ گوناحن.

چەن جوانە! لەم نیو شعری دووهەمەدا کۆکردنەوەی (جزا، إعدام، گوناح).

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە عربیی‌یەی کە لە معنای شعرەکەی پێشوویایەیتی:

لقد حرم الاملاك نيل خلافة
فما لهم ذنب سوى عدم الذنب(14)

یعنی فریشتە بی بەش کـراوە لـە خـاوەن داری سـەر زەوی، هیـچ گوناحیکیشـان نیـە تـەنیابی گوناحی نەبی، واتە چونکە بی گوناحن شایستەی خاوەن داری سەرزەویی نیین.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی کە لە معنای دوو شعرەکەی پیشوویایەتیی:

بخطا شویم شایان بمراحم خدای
نکند شکار رحمت بجز أهوی خطایی(15)

یعنی بە گوناح کردن ئەبم بەشایستەی میهرەبانیی خوا، واتە ئەگەر گوناح ئەکەم و خـوا لێـم خوشنەبی، میهرەبانیی ئەوەدرناکەوی راوی رحمت ناکات ئاسکی(خطا) و(خوتەن) نـەبی– کە ناوی دوو شوینە لەچیین– واتە ئاسکی غیری خطا و خوتەن کە راوبکری بوسەر برریین و گوشتەکەیەتی، بەڵام ئاسکی خطا و خوتەن بوراگرتن و میسکەکەیەتی، یعنی هـەر وەك ئاسك تـا(خطـا)یـی نـەبی رحمی‌پی ناکری، منیش تا(خطایی) نەبم، واتە خطام نەبی رحمم پی ناکری.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

از فکر شرحه شرحه دلا همچو شانه باش
آسان نمی توان سرزلف سخن گرفت(16)

یعنی ئەی دل! لەرێی بییر کردنەوە و ووردبوونەوەدا لەت لەت و پارە پارە بە وەك دانەی شانە، چونکە ئەگەر وانەبیی ناتوانیی بە ئاسانیی سەری زولفی قسەو گوفت و گوبگرییت، واتە هەر وەك شانە تا دانە دانە نەبی ناگاتە زولفی دلدار و بە کاری خوی ناگات، دلیش تا لە بییرکردنەوە پارە پارەنەبی، ناتوانی دەم لە هەموو باسیکەوەبدا.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە عربی‌یەی:

معظم خلق الله فیهم معزز
لهذا تحاذی بالعیون المناظر(17)

یعنی هەر کەسیك بەچاوی سەنگیینی و گران تەماشای مەردوم بکات خوشی سەنگیین و گران ئەبی لەناویانا، جا هەر لەبەر ئەمەیە کەوا چاویلکە هەمییشە ئەخریتە سەرچاو، واتە چونکە شت بەگەورە ئەبینبی بویەخوشی وا خوشەویستە.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

دنیا بعینه چو حبابیست هیچ و پوچ
پوچ است بنگری چوشکست است گشت هیچ(18)

یعنی دنیا وەك بلقی سەر ئاو هیچ و پووچە، واتە تاهەیە پووچە، کەنەش مائەبی بەهیچ.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

خورشید چو برأینه تابان گردد
أینه انا الشمس نگوید چکند(19)

یعنی روژکەدای لە ئاوینە ایتر ئاوینەکە ناچارە کە بلی من روژم، چونکە روژەکەی بەتەواویی تیایە.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

درمیان جبر و تفویچ اختیاری هست و نیست
همچو آن ماهی کەمی آید فرود از آب شار(20)

معنای ئەم شعرە لە حاشیەی سەر ترجمەی رسالە فارسیی‌یەکەی مفتی‌دا ئەنووسیین لە بابی تألیفیا.

هەر لە فلسەفەی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

بعزم دیدن لیلی مپوی صحرارا
زخود بجوی سیه چادر سویدارا(21)

یعنی بوبینینی خوشەویست چول و بیابان مەبررە، بەلکو هەر لە کراسی خوتابگەرری بورەشمالی ئەو، کە ناوەراستی دلتە.

هەر لە فلسفەیەتی ئەم شعرە فارسیی‌یەی:

شعری سکالا وپەندی:

زور لە شعرەکانی مفتی سکالان لەگەل پەندو ئاموژگارییدا، وەبەم شعرانەی ئەبەوی باسی چەن دەردیکی کومەلە بکا و پیش چاویان بخا بەلکو چارە بکرین.

لە سکالایەتی ئەم قصیدە فارسیی‌یە:(22)

رسیده این زمان کبر و غرور ناکسان جایی
که بیند خویشتن راهرمگس از عجب عنقایی(23)
گمارد خویشرا هر ذره   ناچیز خورشیدی
شمارد خویشرا هر قطره   بی قدر دریایی(24)
درین ایام نبود تاجهارا رتبه کفشی
وزین هنگام سرهارا نباشد عزت پایی(25)
بود مأوای دانایان بدهرارهست پایینی
شود مأوای نادانانی بەکون ارهست بالایی(26)
هزاران مدعی هستند عالم در قچا لکن
زبان حال کس هرگز نکرد اثبات دعوایی(27)
بروخندند نادانان و گرید از پشیمانی
اگر گوید بەایشان حرف حتی بالفرچ دانایی(28)
همه مختل دماغند از فساد خلط کسن کند
بة انتیمون پندناصحان تسکین سودایی(29)
هەزاران درجهان جالوت هست و نیست داودی
فراوان برزمین فرعون هست و نیست موصایی(30)
حمەگم کرده راهانند و نبود در جهان خضری
همه کور و کر و لالند پیدانیست عیسایی(31)
هزاران أزروبتگر عیانندو خلیلی نیست
بود چون نینوی هر شهر و نبود   ابن متابی(32)
بسی هستندمرتدین درغا   نیست صدیقی
قضایامشتبه باشندودردا   نیست مولایی(33)
شیاطین بیشمار ندو بعالم   نیست فاروقی
منافق هست هرجاوو حزیفة   نیست درجایی(34)
ازین اوضاع ناهمواریی هنجار   می رستم
اطر می یافتم(فیضی) درین   طنبدد طرجایی(35)

هەر لە سكالايەتى ئەم رباعى يە فارسيى‌يەى:

شيخا توكه در عالم ظاهر فردى

اين رتبه زدستار بدست أوردى

حيف است كة او دور سرتو گردد

بايست كه تو دور سراوگردى(36)

يعنى ئەى شيخى نەخويندەوار، توكه ئەمررو لە جيهاندا تاكيى، ئەم پايە بەرزەت لەسايەى ميزەرەكەتەوە دەست كەوتووە، كەوابوو حەيفە ئەو بەدەورى سەرى تودا بگەررى، بەلكو ئەبوايە تو بەدەورى سەرى ئەوا بگەرِاى تايە.

هەر لە سكالايەتى ئەم رباعى يە فارسيى‌يەى:

تركيب ملاچودر ازل از الم است

بيچاره نصيب او همه دردوغم است

شادى بدلش چگونه صورت بندد

گرقلب كنى حاصل قلبش لم است(37)

يعنى ووتەى(ملا) هەر لە أزلدا لە پيتيى(الم) داريژراوە، لەبەر ئەمە ملاى بيچارە هەمييشە بەشى هەرداخ و زووخاوە، خوشيى چون جى ئەبيتەوە لە دليا؟ ئەگەر پيتيى (ملا) پيچەوانە بكەيتەوە ئەبى‌بە(الم) كەبە معنى خەم و خەفەتە.

هەر لە سكالايەتى ئەم شعرە كورديى‌يەى:

خواهيشتە ئەگەر دائمە توبتخەنەسەر چاو

لەم عالەمەدا عينى درويە وەكو عينك(38)

يعنى ئەمرِو لە ناو مەردومادر و زور پەسەند، و دروزن زورلەپيشە، تەنانەت چاويلكەش كەوا خوشەويست، وە هەميشە لەسەرچاوانە، هەر لەبەر ئەوەيە كە دروزنە، وە هەمييشە ياشتى پچووك بە گەورە نيشانئەدا، وە دوور بە نزييك دەرئەخات، وە يا تارييك بەروناك ئەنوينى.

هەر لەپەندو ئاموژكاريى‌يەتى ئەم شعرە عربى‌يەى:

لاتدع في حاجة بازا ولا اسدا

اللة ربك لاتشرك به احدا(39)

يعنى لە كاتى تەنگانەدا هاوار نە لە عبدالقادرى گەيلانى‌وە نەلە ايمامى على بكە، بەلكو هەر هاوار لە خوابكە، چونكە هەر ئەوەخواى تو، وەشريك و هاودەمى بو پەيدا مەكە.

حيفاكه دين پاك نبى‌را به باد داد

در سنيان تشيخ و در شيعه اجتهاد(40)

يعنى زورحەيف كەوا دووشت ئايينى پاك و تەمييزى اسلامى‌بە بادا، يەكەم شيخيتى لە ناو سنى و دووەهەم اجتهاد لە ناوشيعەدا.

هەر لە سكالايەتى ئەم شعرە توركى‌يەى:

عجيمى بردنى طعن ايتسه برعالى جناب اوزره

بوگون وارينجه ظالم لكة بولمش أفتاب اوزره(41)

يعنى ئايا بەدوورى ئەزانن ئەگەر پەست پايەيەك توانج بگريتە پايە بەرزيك؟ نەادوورنيە، ئەمرروستەم كارى وا هەيە كە پەلەو خالى رەش لەسەر رووى روژئەدوزيتەوە.

هەر لە سكالايەتى ئەم شعرە توركەيەى:

راشى و مرتشى ورائشەوار در لغنت

نه اولور حالى عجب صاحبى بواوچ علت

يعنى لعنتى‌خوا بو ئەو كەسەيەكە بەرتيل ئەدا، ياوەرى ئەگرى، يا ئەبى بەمايەى وەرگرتنى، انجا ئەبى حالى ئەو كەسە چونبى كە خاوەنى ئەم سەر ووشتە پييسەبى؟

هەر لەسكالايەتى ئەم شعرە عربى‌يەى:

شيب رأسى فى شبابى لا تعدوه عجيبا

ان هذا اليوم يوم يجعل الولدان شيبا(42)

يعنى سەرسام مەبن لەسپيى‌بوونى سەرم لەگەنجييما، چونكە ئەمرِو روژيكە بەخەمو خەفەتى خوى منال پييرئەكات.

هەر لە سكالايەتى ئەم رباعى‌يە فارسيى‌يەى:

عالمى خواهم ازين عالم بدر

عنصر وى خاك باشد سر بسر

دربن هرموى دستى رويدم

تا بكام خود كنم خاكى بسر(43)

يعنى جيهانيكى ترم ئەوى لەم جيهانەبەدەر، كە عنصرى ئەوهەر خاك بى و هيچى تر، لەبنكى هەموو موويەكى ئەندامييشم دەستيكى لى برِوايە، تابە ئارەزووى دلى خوم خاكم بكردايە بەسەرما.

**شعرى دلداريى مفتى**

لەشعرى دلداريى‌يەتى ئەم رباعى يە فارسيى‌يەى:

بەباغم بلبلم من كزغم دل زارمى نالم

گەازبى مهرى گل، گەزجور خارمى نالم

ميان نالەى مانيست چندان فرق اى بلبل

توپرِخسارگل، من برگل و خسارمى نالم(44)

يعنى بلبليكم لە باخا، لە داخا ئەگرييم، دەمى لەبەريى ميهرەبانيى گول، دەميكيش لەبەرستەم و ناسورى درِكەكەى ئەناليىنم. جياوازيى‌يەكى ئەو تەولە ناوەندى نالەى من و تودانيە ئەى بلبل، چونكە تو بەسەر روخسارى گولدا ئەگرييت و منيش بەسەرگولى روخساردا ئەگرييم.

هەرلە شعری دلدارییەتی ئەم رباعی یە فارسییەی:

خوش أنگە جان ورە بسپارییم و بسپرییم

یعنی کە عاریت بگزارییم و بگزرییم

مارا میسر ار نشود دیدن نگار

برلوح، صورتش بنگارییم و بنگرییم(45)

یعنی چەن خوشە ئەودەمەی کە گیان بسپیرم و ریگای ژیین ببرم، واتە ئەم سپاردەیەی کەلەلامە- وەك گیان و ریگای ژیین بی- بەجبی بیلم و بی برزم، ئەگەر بینییلیی دلبەرم بوریك نەوکەی، وینەکەی لەسەر رووپەرەی دلم ئەکیشم و تەماشای ئەکەم.

هەر لە شعری دلدارییەتی ئەم رباعی یە عربیەی:

اضیف الدجی معنی الی لیل شعره

فطال ولولا ذاك ما خص بالجر

وحاجبه نون الوقایة ما وقت

علی شرطه فعل الجفون من الکسر(46)

یعنی لە مضیدا اضافەی شەوەزەنگ کرا بوسەرمووی دلبەر، وە رەشی و دریژیی هەر دوکیان کەوتە سەریەك، بویەوا مووی دلبەردریژبووە بەم رەنگەی کە بەسەر زەوییدا رای ئەکیشی،(47)، بروی دەلبەر(ن)ی وقایەیە، واتە وەك ئەو کەوانەیییە، کەبە اخری هیندی(فعل)ەوە ئەنووسی، وەپاسی پیتەکەی پیش خوی ئەکا لە(کسرە) یعنی لە(ژیر)، بەلام ئەم نوونی وقایەیە لیرەدا-کەبرویەتیی- پاسی کردەوەی پیلووی چاوی نەکردووە لە(کسرە)، یعنی لە شکاندنی دلی دلداران(48)، واتە دلبەر هەمیشە بەگریشەو نازو غمزەی چاوی، دلی دلداران ئەشکینی.

چەن جوانە!! لەیەك رباعیدا کوکردنەوەی پینج اصطلاحی علمی نحو، وەك(اضافة، جرە، نون وقایة، فعل، کسرە)بی.

**هەر لە دڵداریی یەتی ئەم شعرە فارسی یەی:**

لازم دوری زخوبان حسرت و دیوانگی است

از فراق یوسف است درسجن جن درچاە أە(49)

یعنی لازمی دوورکەوتنەوەیە لە جوانان خەفەت خواردن وشیت بوون، نابیینی بەهوی جوی بوونەوەی حضرتی(یوسف) لە(سجن) یعنی زیندان، ئەمەکەوا أخری ووتەی سجن(جن)ە، وە بەهوی دوورکەوتنەوەی یوسفە لە(چاە) یعنی بییر، ئەمەکەوا اخری ووتەی(چاە)(أە)ە.

یعنی(سجن) و(چاە) هەر چەندە گیان لە بەرنین تا بە دوورکەوتنەوەی جوانیکی وەك یوسف خەفەت بخون وشیت بن، بەلام لەگەل ئەمیشە هیشتابیبەش نەبوون لەشیت بوون، نابینیی؟ کە لە نووسییندا ئەم دوو، ووتەیە هاودەمی(جن) و(أە) ن.

یعنی چاە بویە أخرییەکەی(أە)ە، کأنە هەمییشە هەر ئاهو هەناسەی ساردهەل ئەکیشی بو دوورکەوتنەوەی یوسف لیی، وە (سجن)یش بویە أخرییەکەی(جن)ی بەمعنی(جنوکە)یەئەلین هەر کەسیك گویا بیبیینی شیت ئەبی-کأنە لەداخی هاتنەدەرەوەی یوسف هەمییشە خەرییکە شیت ببی!.

هەر لە دلداریی یەتی ئەم شعرە فارسییەی:

ای مصور صورت یارمرا با نازکش

چون بنازش میرسی بگزرکەمن خودمی کشم(50)

یعنی ئەی وینەگر! وینەیارم زور بەنازەوە بکیشە، بەلام کە گەیشتیتە سەرگرتنی نازو عشوەی بیدەرە دەستم، خوم ئەوەی بکیشم.

هەر لە دلدارییەتی ئەم شعرە فارسییەی:

دل من زسینەگم شدتهمت بکس نبردم

بەغیر تو در اینجا کسی رهی ندارد

یعنی دلم لە ناو قەفەسی سنگماوون بووە، گومانم لەکەس نیە تونەبی چونکە هەر توی کە هات و چوی ئەویت هەیە.

هەر لە دلدارییەتی ئەم شعرە فارسییەی:

رخسار یارم چە أتشینی است

أتش پرستم گرأتش اینست(51)

یعنی روخساری یارم وەك ئاگر ئەدرەوشیتەوە، ئەگر ئاگروا جوان بی من ئاگر پەرستم.

لە ناوەندی(أتشینی است) و(أتش اینست)دا جناس هەیە. هەر لە دلدارییەتی ئەم شعرەی کە نییوەی کوردیی و نییوەی فارسییە:

گەهی دردیك ئەکا درمان بەقتلی، گە ئەدا فەرمان

منم کز غایت حرمان نەبا أنم نەبا اینم(52)

یعنی دلبەر هیندی جارەرمانی دەردی دلدارئەکاو هیندی جاریش فەرمانی کوشتنی ئەدا، بەلام ئەمەند بیبەشم نەلە دەرمانی بەهرەمەندم وەنەلە کوشتنی بەشدارم.

محوی افندی ئەم شعرەی کردووە بەرباعی، ئەگیرنەوە کە لە سالی(1291هـ) محوی لەگەڵ چەن ملایەکی تر لە سلیمانی نفی ئەکرین بوبغدا، لەوی ئەچی بودییدەنیی مفتی، زەهاویی لەبەر پیریی و چاو کزیی محوی ناناسیتەوە، وە لەمیانەی قسەدا ئەم شعرەی خۆی ئەخوێنێتەوە، محویش ئەڵێ: قوربان! ئەم شعرەت رباعییە، شعرەکەی پێشووی ئەمەیە:

وەکو محرومی نوشینی مەیی أو لعلی نوشینەم

لە ذوقی چەشتنی نیشی مژەیشی بێبەشە سینەم

**انجا مفتی ئەی ناسییتەوە، انجا محوی کوتوپڕ ئەلێ:**

**جنابی مفتی افندی رشینەیەك باران**

**لە دلتی ششتەوە نقشی محبتی باران**

**خیالی ایوە بە لیشاوی توند و تیژی سورشك**

**نەچۆتەوە لە عقیقی دلی وفاداران**

## پەراویزەکان

=1308 بووە بە اندامی محکمەی استئناف، لە 1896م دا لەئەستەمووڵەوە بانگ کرا، و لەگەڵ بعثەی اصلاحات دا نیررا بۆ (یمن)،وە لە پاشی سالیك گەرایەوە، وە نیشان و رتبەی (بلاد خمسە)ی درایە، لەدوای اعلانی مشروطیتی عثمانی کرا بە نائبی بغدا و چووەوە بۆ ئەستەمووڵ، لە دوای جەنگی گەورەی یەکەم گەرایەوە بۆ بغدا، لەسالی 1925م کە تشکیلی حکومتی عراق وە اعلانی دستور کرا بوو بە ئەندامی مجلسی أعیان، لە سالی 1935م دا لە بغدا مردووە.

جمیل صدقی لە زمانی عربی و فارسی و ترکی و کوردیدا شاعریکی بلند و یەکتا بووە، قسەی نەستەق و بەرزی زۆرە، پانزە تألیفی زۆر جوان و بەنرخی هەیە کە أمین زکی بگ لە (تأریخی سلیمانی و وولاتی)دا یەك بەیەك ناوی نووسیوون.

1–لە 15ی جمادی الاخری 1284ھ لە بغدا لەدایك بووە، خاوەن زەوی و زار وە بەکشت و کالەوە خەریك بووە، وە لەبغدا مردووە.

2–یعنی (داود) کە ئەبێ بەدوو (و) بنووسرێ، کەچی ئیستا بەیەك (و) ئەنووسرێ، وە (عمر) کە (و)ی نیە کەچی (و)یکی لەدوواوە بۆ ئەنووسرێ، بۆ ئەوەی لە خویندنەوەدا لە (عمر) جیابببیتەوە، جا بەم بۆنەیەوە گوایا (عمرو) ئەو (و)ەی لە (داود) دزیبوە!.

3–ئەم آیتە حکایەتی ئەو دەمە ئەکات کە ابراهیم پیغەمەریان خستووتە مەنجەنیقەوە، وە خوا بەم آیتە فەرمان ئەدا بە آگرەکە کە ساردببیتەوە و نەی سوتینیت.

4–پیم وایە کابرای عرب لە پلارەکەی مفتی گەیشتووە، وە نە جوابەکەشی ئەو نکتەیەی مەبەست بووە کە مفتی تێی گەیشتووە بەڵام مفتی چونکە بە قسەکەی خۆی پلاری مەبەست بووە، بۆیە معنای وەرامەکەی ئەویشی وا لیك داوەتەوە.

وینەی ئەمە: جاریکیان چند ملایەك لە سلیمانی ئەچن بۆ دیدەنی ملا محمدی چائی. لەوێ بەریکەوت قسە لەم حدیثە کیویلەیە ئەکەن کە بەدەمی پیغەمبەرەوە هەڵ بەستراوە، کە گوایا فەرمویەتی: (اکثر اهل الجنة البلهاء) یعنی زۆرترینی بەهەشتی مەردومی گیل و گەمژە، لەو میانەدا ملا رشید بەگ بە ملا محمدی چائی ئەلیت: خۆزگەمان بەخۆت کە بەهەشتیت، ئەمیش بەبێ ئەوەی کە تێ بگا ئەلێ: الحمد لله هەمولایەکمان بەهەشتین!.

5–ئەم شعرەم لەملا غالبی خانەقینی بیستووە.

6–ئەم رباعییە بە خطی (شیخ حسن)ی قەرەداغی لەپشتی کتیبی (قاضی) نووسراوە، کە ایستا لای (شیخ نوری) باباعلییە، وە لەگەلی شوینی تریش دییومە.

7–ئەم رباعییەم لە ملا غالبی خانەقینی بیستوە.

8–ئەم شعرەم لە مامۆستا احمد حامدی صراف بیستووە.

9–ئەم رباعییە و رباعییەکەی دوای بە خطی (ملا محمدی) کەوانە دولی کە مجازی مفتی بووە نووسراوە لەپشتی کتیبیکی دەست خط کە ایستا ئەو پەرەیەیم لەلایە.

10–ئەم شعرانە (جمیل صدقی) زەهاویی بەناوی باوکیەوە، وەری گرتوون وە خستونیە ناو قصیدەیەکی دریژی خۆیەوە لە یەکێ لە دییوانەکانیا.

11–ئەم رباعییەم لە حاجی ملا محمد نوری کوری ملا احمد کویر وەرگرتووە.

12–ئەم رباعییە و دوو رباعییەکەی دووایی بە خطی ملا محمدی کەوانە دولی نووسراوەتەوە و لەلامە.

13–ئەم شعرەم لە ملا غالبی خانەقینی بیستووە، وە لە پشتی تهذیبەکەی شیخ علی قەرەداغیش نووسراوە.

14–ئەم شعرەم لە ملاغالبی خانەقینی بیستووە.

15–ئەم شعرەم لە ملا غالبی خانەقینی بیستووە، وە لەپشتی تهذیبەکەی شیخ علی قرەداغیش نووسراوە.

16–ئەم شعرە عبدالله جودت لە حاشیەی ترجمەی رباعیاتی عمر خیامیا نووسییویەتی.

17–ئەم شعرەم لە ملا غالبی خانەقینی بیستووە.

18–ئەم شعرەم لەمرحوم امین زکی بگ بیستووە.

19–ئەم شعرە لەپشتی تهذیبەکەی شیخ علی قەرەداغی نووسراوە.

20–ئەم شعرەم لە حکمت زەهاویی بیستووە.

21–ئەم شعرەم بەکاغذ الملا عبدالرحمنی کوری ملامحمدی کەوانەدولی وەرگرتووە.

22–ئەم قصیدەیە لە لایەن شاعر و زانای بەناوبانگ سید احمد نقیبەوە تخمیس کراوە.

23–یعنی لەم رۆژەدا دەعیە و دەماری مەردومی ناوەجاخ گەیشتووە بە ئەندازەیەك کە هەموو میشیك خۆی بە عنقایەك ئەبینێ.

24–یعنی هەموو شتیکی وردیلانەی بێ نموود خۆی بەرۆژیکی درەخشان ئەزانێ وە هەموو دلۆپە ئاویکی بێ نرخ خۆی بە دەریایەك ئەژمیرێ.

25–یعنی لەم رۆژانەدا هیچ تاجیك بەقەد کەوشیك نرخی نیە، هەروەك گەلی سەری واش هەیە کەپێیەك ناهینێ.

26–یعنی کام شوین لەجیهانا پەست و پایین ترە، ئەوی جیگای زانایان و دانایانە، وەکام شوینیش بەرز و باڵایە ئەوی جیگای نادانان و هیچ نەزانانە.

27–یعنی هەزاران کس لافی زانایی لی ئەدا لە هەموو جۆرە علمیکدا، بەڵام هیشتا هیچ کامیکیان اثباتی دعوایەکی خۆی نەکردووە.

28–یعنی ئەگەر دانایەك قسەیەکی راست بلێ بەنادانیك پیی پێ ئەکەنێ، وە داناکەش لە پەشیمانیدا گریانی دێ.

29–یعنی هەموو میشك تیك چوون بەهۆی تیك چوونی دەرونیانەوە، کەسیك نیە کە بە ئامۆژگارییەکی دڵ سۆزانەی وەك (انتیمون) –کە دەرمانی سەودایە– چارەی دەردی رەووشتو خووی ناشیرینیان بکات، کە وەك ناساغی سەودا، دای وەشاندوون.

30–یعنی لەم جیهانەدا هەزاران جالوتی ستەمکار هەیە، بەڵام داودیك نیە کە بیکوژێ، وە گەلی فرعونی زۆردار هەیە وەلی موسایەك نییە کە بییان خنکینێ.

31–یعنی هەموو سەرلی شیواو و گوم راهن و خضریکی زیندەنیە کەبیان هینیتەوە سەر رێ، وە هەموو کویر و کەر و لالن عیسایەك نیە چاکیان کاتەوە.

32–یعنی هەزاران بت تاشی وەك (آزەر) هەن بەڵام ابراهیمیکی خلیل نیە کە بتەکانیان بشکینێ، وە گەلی شای وەك (نینوی) هەیە بەڵام (یونس)ی پیغەمبەری کوری (متی)ی تیانیە کە لەسزای خوا رزگاریان بکات.

33–یعنی مرتدی تازە کافر زۆرن بەڵام (ابوبکر)یکی صدیق نیە کەبییان هینیتەوە سەرە رێی ایمان، وە گەلی مسائلی تیکەڵ و پێکەل هەن وەلی داخەکەم امامیکی (علی) نیە کە لەیەکیان جیابکاتەوە.

34–یعنی دیوو شیطان لەجیهانا زۆرن بەڵام حضرتی (عمر)یك نیە کە شیطانەکان لیی بترسن و رەوی لەبەربکەن، منافقی ناپاك لە هەموو شوینیك هەیە، بەڵام (حزیفە)یەك نیە کە دەریان بخا نییو شعری دووهەم اشارەیە ئەبال فەرمووەدەی حضرتی عمر کە وتویەتی: هەر کەسێ حزیفە نویژی لە پشتەوە نەکا بەمنافقی ئەزانم.

35–یعنی لەم چۆنیتی بەناریکە ناشیریینە خۆم رزگار ئەکرد ئەگەر لەم جیهانە بەدەر جیهانیکی ترم شك ببردایە.

36–ئەم رباعی‌یە مرحوم امین زکی بگ لە (تأریخی سلیمانی‌و ولاتی) دا نووسییویە.

37–ئەم رباعی‌یەم لەملا عبداللّەی چوڕوستانی و مرحوم طاهر عثمانی کرکوکی بیستووە.

38–ئەم شعرەم لە مفتی سلێمانی مرحوم عبدالعزیز افندی بیستووە.

39–ئەم شعرە مرحوم امین زکی بگ لە (تأریخی سلیمانی‌و ولاتی)دا نووسییویە.

40–ئەم شعرەم لە مرحوم سید احمدی خانەقا بیستووە.

41–ئەم شعرە و شعرەکەی دووابیم لە زین العابدینی کوڕی ملا فانی بیستووە.

42–ئەم شعرەم لە ملا غالبی خانەقیینی و مفتی عبدالعزیز بیستووە.

43–ئەم رباعی‌یەم لەملا عارفی چنگنیانی بیستووە.

44–ئەم رباعی‌یەم لەماموٚستا احمد حامدی صراف بیستووە.

45–ئەم رباعی‌یەم لەملا عارفی چنگنیانی بیستووە.

46–ئەم دوو شعرەم لەملا عارفی چنگنیانی بیستووە، وە لەپشتی (شرح معنی)یەکی کوٚنیشا هەر بەناوی مفتی زەهاوییەوە نووسراوە، بەلاّم لە کەشکوٚلێکی دەست خطی ترا بەناوی (امیر امین الدین علی کوڕی عثمانی سلمانی)یەوە نووسراوە.
ئەم رباعی‌یە زۆر لەرباعی‌یە عربی‌یەکەی شێخی (سعدی) ئەچێ لە گولوستانا کە ئەڵێت:

بليت بنحوی يصول مغاضبا
علی کزيد في مقابلة العمرو
علی جرزيل ليس يرفع رأسه
فهل يستقيم الرفع من عامل الجر

47–یاخوا بلیێن بویە وا مووی دلبەر وەك کەمەند تەرخان کراوە بۆ راکێشانی دڵی دڵداران.

48–یا لە شکاندنەوەی چاوی رەوەوزەویی، یعنی دلبەرەکە شەرمنە، وە هەمیيشە چاوی داخستووە.

49–ئەم شعرەم لەملا غالبی خانەقیینی بیستووە.

50–ئەم شعرە و شعرەکەی دووابیم لەماموٚستا احمد حامدی صراف بیستووە.

51–ئەم شعرەم لەمرحوم ملا عارفی امینی وەسمان بیستووە.

52–ئەم شعرەم بەچیرۆکەکەی دووایەوە لەملا اسعدی نەوەی (محوی) بیستووە.

## سەرچاوە

مفتی زەهاوی، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد (1953).

# قسەی بەرز لەوێژەی خۆو بێگانەدا


بە یارمەتی لیژنەی نیشتمانی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی هاتنی
سەدەی پانزەهەمی کۆچی یەوە لە کۆماری عراق ـ لە چاپ دراوە

نالەی دەروون

کۆمەڵە ووتارێکی وێژەیی و مێژوویی و ئایینیی و کۆمەڵایەتیین
نوسراوون بە قەلەمی

شێخ

محمدی خال

ئەندامی کۆری زانیاری عراقی

جزمی یەکەم

چاپی یەکەم

چاپخانەی ارشاد ـ بغداد
١٤٠٤هـ ـ ١٩٨٤

قسەی بەرز، بە قسەیەك ئەڵێن کە لە کاڵایەکی شیرین و مەبەستێکی ڕەنگین دابێ، وە لە دوای ڕووداوو تاقی کردنەوەیەکەوە هەڵقوڵابێ، وە لە دڵ و دەرونێکی ئاوەدانەوە هاتبێتە دەرەوە، وە لەوانەبێ کە ببێ بە چرای دڵ و دەروون و خۆراکی گیان و دار دەستی ژیان.

هەموو گەلێك لەم جۆرە قسانەی هەیە، ئینجا هەریەکەی بە پێی تێگەیشتن و زانیاریی و بەسەرهات و بیرو باوەڕی خۆی، هەر قسەیەك لەم قسانە دەرمانی نەخۆشی یەکە، یا مەڵحەمی برینێکە، یا چرای تاریکی یەکە، یا پلەی ڕێگایەکی سەختە، یا سەرمەشقی ژیانێکە، ئینجا لە چەند زمانێکی بێگانە چەند قسەیەکی بەرز و ووتارێکی نەستەقم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی تا هەموو لایەك بەهرەی لێ وەرگرین، وە کەمێك لە بیرو باوەڕی گەلانی تر بگەین.

### لەویژەی ئینگلیزیی و ئەمریکانی یەوە:

1–هەرچی ژیریی جیهان هەیە هەموو لەسەر یەك ئایینن.

2–پیاو کوشتن ڕێگای مێژووی جیهان ناگۆڕێ.

3–یا سەربەستیم، یامردنم.

4–شتی گەورە لە نزییکەوە نابینرێ.

5–مەردوم ژیانی سادە پەسەند ناکەن، لە کاتێکا کە کلیلی دەرگای دڵە.

6–هەر کەسێك نرخی خۆی هەیە.

7–شۆڕشی بییرهەمییشە لە پێش شۆرشی لە شکرەوەیە.

8–نادانیی هیچ کێشەیەك نابڕێنێتەوە.

9–ئاشتبوونەوەی پڕ لە زۆر و ستەم، باشترە لە جەنگی پڕ لە داد.

10–ئەگەر هەموو ئارەزوویەکمان بێتەدیی، کەلێ خۆشیمان لە دەست دەرئەچێ.

11–پرسیار کرا لە(ملتن): بۆچی زمانێکی تر فێری کچەکەت ناکەیت، ووتی ژن زبانێکی بەسە.

12–شیعر ووتن پییشەی تەمەڵە.

13–ئاگاداریی فلس بکە، دینار ئاگاداریی خۆی ئەکات.

14–هیچ شتێك کار ناکاتە منالْ بە قەد مەدح و هەڵدانی.

15–هیچ کەسێك لە خراپیدا نەگەیشتۆتە پایەیەك کە نەتوانێ چاکە بکات.

16–ئەگونجێ ژنێك لە پیاوێك زیرەك تربێ، بەڵام پایەی بەرزی وا هەیە کە هەرگیز ژن نای گاتێ.

17–چاکترین دکتۆر، دکتۆر(پارێز) و ودوکتور(دڵخۆشی)و دکتۆر(بێ خەیاڵی) یە.

18– ئەوەندەی لە قسەو گوفت و گۆی مەردومەوە فێر بووم ئەوەندە لە خوێندنەوە فێر نەبووم.

19–جیهان زیندانێکی گەورەیە، هەموو ڕۆژێك هێندێك لە بەندێکانی لە سێدارە ئەدرێن.

20–بناغەی سەرکەوتن لە هەموو کارێکا، دەست هەڵ نەگرتنە تا ئەگەیتە مەبەست.

21–کتێب لە ماڵا لە هەموو شت جوانترە با نەشی کەیتەوە، وە ووتە یەکیشی لێ نەخوێنییتەوە.

22–ئەوی سروشت ئەیکات، پزیشك و دەرمان نایکات.

23–لەبیرت نەچێتەوە ئەوی یەکێك پێت ئەڵێ لە کاتی تووڕە بوونیا.

24–دواترین قسەی(نلسون) ئەمەبوو:"سوپاس بۆخوا، پێویستی خۆم بەجێ هێنا".

25–سەرپێچی کردن لەستەمکار، خواپەرستییە.

26–خۆشەویستی"محبت" وەك نەخۆشی ئاوڵە وایە، ئەگەر لە وەختی خۆی درەنگتر بێ کوشندەیە.

27–هێندێ کەس کتبێك لە سنگیایەتی و هێندێکیش کتێبخانەیەك.

28–ژیان ببێ، هیوا هەیە.

29–مەردوم ناو بەناو پێویستە بە ڕابواردن لەگەڵ چەند کەسێکا کە پێ بکەن.

30–ژیان مەتەڵێکی زۆر سەیرە کاتێك تێ ئەگەیت کە تەمەن تەواو بووە.

### لە وێژەی فەرەنسییەوە:

1–ناوەندی هیچ و یەك زۆر ترە لە ناوەندی یەك و هەزار.

2-پاشای داد پرس بەندەی کۆمەڵەو گەلی ئازادی خۆیەتی.

3-هەموو ژنێك هەمیشە شتێکی وای هەیە کە بی ترسێنێ.

4-شتی تازە نی‌یە مەگەر لە بیر چوویێتەوە.

5-دۆست و برادەر وەك شتی ناومالْ وایە، کە رزیی ئەگۆڕرێ.

6-وولاتی بە بێداد، لێرەواری پڕ لە دزە.

7-ئەوەندەی بە کەوچکێك هەنگوین ڕاوی مێش ئەکرێ، بە بیست کوپی سرکە ناکرێ.

8-کەسێك لە هاژەی درەخت بترسێ، ناچێتە ناو لێرەوارەوە.

9-ڕوو بە رووی هەموو شتێك بوێستە بەڕاستی و وورییایی، نەك بە دڵتەنگی.

10-(لویسی پانزەهەم) ووتوویەتی: "ئەگەر شەپقەکەم نهێنیم بزانێ ئەیسووتێنم".

11-(ڤۆلتێر) ئەڵێ: ئەگەر خوانەبێ، پێویستە ئێمە دروستی بکەین.

12-دین نەخۆشەو دکتۆرەکانی پشت گوێیان خستووە.

13-ئەو سەربازەی زۆر نەنوێ لە جێی دوو سەربازە.

**لەوێژەی یۆنانی‌یەوە:**

1-یەکەم دەرسی فەلسەفە ئەوەیە: کە وەختی باش بدۆزیتەوە بۆ هەموو شتێك.

2-خێرا بمرییت چاکترە لەوەی کە چاوەڕوانی مردن بکەویت.

3-مانای ئەمە کە دووگوێ و زبانێکمان هەیە ئەوەیە کە گوێ گرتنمان لە قسە کردنمان زیاتر بێ.

4-(دیۆ جینیس) لە نیبوەڕۆدا چراکەی هەڵگیرساند، لێ یان پرسی: ئەوە چی ئەکەیت؟ ووتی: بەشوێن مرۆڤا ئەسووڕێمەوە.

5-کەسێ بزانێ قسە بکات، ئەبێ بشزانێ کەی قسە بکات؟

6-پیاوێك لە (سوقراط)ی پرسی: ژن بێنم یانەی هێنم؟ ووتی: هەرکامێکیان بکەیت هەر پەشیمانیت.

7-ئەگەر پێستی شێر و پڵنگ نەبوو، با پێستی ڕێویی بێ.

8-(کاتۆ) ئەڵێ: ئەگەر بپرسن بڵێن: ئەوە بۆچی فیسار کەس پەیکەری بۆ نەکرا؟ چاکترە لەوەی کە بڵێن: بۆچی بۆی کرا؟

9-(ئەسکەندەر) چووە بەردەمی(دیوجینیس) پێی ووت: چی داوا ئەکەیت بۆت بکەم؟ ووتی: تۆزێ دوور کەوەرەوە و بەری هەتاوەکەم لێ مەگرە!.

10-ئەسکەندەر کە(دیوجینیس)ی خوا پەرستی دیی ووتی: ئەگەر من ئەسکەندەر نەبوومایە، ئاواتم ئەخواست کە دیوجینیس بوومایە.

11-(یولیوس قەیسەر) مێژووی ئەسکەندەری ئەخوێندەوە، دەستی کرد بەگریان، لێ یان پرسی بۆچ ئەگرییت؟ ووتی ئایا جێی گریان نی‌یە؟ ئەسکەندەر لەگەنجی‌دا ئەم هەموو وولاتە بگرێ و کەچی من تائێستا ئیشێکی گەورەم نەکردووە؟!

12-تۆ ناتوانیت ملە ملە بکەیت لەگەڵ خواستی خوادا.

13-(سوقرات) ووتوویەتی: من نەکوڕی (ئەسینا)م نەکوڕی(یۆنان)م بەڵکو کوڕی(عالەم)م.

14-ئەسکەندەر ووتوویەتی: هەروەك زەوییی دوو ڕۆژ هەڵناگرێ ئاسیاش دوو پاشا هەڵ ناگرێ.

15-پیشەی شوانی چاك و پاشای چاك یەکن.

16-لەشکرێك لە بزنە کێویی کە شێرێکی بەسەرەوەبێ، بەسام ترە لە لەشکرێك لە شێر کە بزنەکێوییەکی بە سەرەوە بێ.

17-خۆشەویستی ماڵی دنیا سەر چاوەی هەموو خراپەیەکە.

18-وە جاخزادەیەك نەنگی لە یەکێك ئەگرت کە گوایا وەجاخزادەنی‌یە، ئەمیش ووتی خێزانی من لەمنەوە دەست پێ ئەکات، بەڵام خێزانی تۆ لە تۆدائەکووژێتەوە.

19-(سوقرات) ووتوویەتی: خەڵقی ئەژیین بۆ ئەوەی بخۆن، من ئەخۆم بۆ ئەوەی بژییم.

**لەوێژەی ئەڵمانی‌یەوە:**

1-ئەسپی ئازا لە خەندەقا ئەمرێ.

2-فێربە کە لەگەڵ ناڕەحەت بوویت بە زبان نەی درکێنیت.

3-برانەوە لەگەڵ ترسا، چاکترە لە ترسی بێ برانەوە.

4-دەردی گەورە ئەوەیە کە پاشاکانمان قسەی ڕەوا(حق) نابیستن.

5-ئێمە-کەئەڵمانین- لە خوا ئەترسیین و، لە کەسی تر ناترسیین.

6-لای ئێمە هەر حکومەتێ بەبێ حزب سەر ئەکەوێ.

7-باسکردنی ئەڵمانیا بە هەموو جۆرێك مافی هەموو ئەڵمانییەکە.

8-یەکێك نرخی ژیانی ئەزانێ کە لەکاتی لە دایك بوونیا سەری کەوتبێتە سەربەردێکی ڕەق، نەك دەستێکی نەرم.

**لە وێژەی لاتینی‌یەوە:**

1-لەبەر ئەوەی کە مردن هەیە هیچ کەس بەختیار نی‌یە.

2-کتێبی بێ کەڵك لە جیهانا نیە با زۆر هیچ و پووچیش بێ.

3-سەرۆکێك کە تۆڵە لە خراپ نەسێنێ، ئەوە هانەهانەیە لەسەر خراپە کردن.

4-ئەگەر بەپێی دەستوور و باوی خوا بژییت لە جیهانا هەرگیز هەژار نابییت، وە ئەگەر بە پێی ئارەزووە هیچ و پووچی خۆشت بژییت هەرگیز دەوڵەمەند نابیت.

**لەوێژەی ئیتاڵی‌یەوە:**

1-بە ئازادیی بووم و بە ئازادیی ئەژییم و بە ئازادیی ئەمرم.

**لەوێژەی عەرەبی‌یەوە:**

1-گەرم بە لە سەرمردن ژیانت پێ ئەبەخشرێ.

2-لەسەر خۆیی‌یەك دوایی یەکەی لە دەست چوونی شتێك بێ، چاکترە لە پەلەیەك ، کە دوایی‌یەکەی دەستکەوتن بێ.

3-جەنگ سەرەتای بۆڵەیەو ناوەڕاستی سرکەیەو دوایی‌یەکەی بەڵایە.

4-چاکترین بەخشین ئەوەیە کە لەهەژارێکەوە بۆ هەژارێك بێ.

5-ئەگەر هەموو کەسێك ژیر بێ، جیهان وێران ئەبێ.

6-بەزەیی‌تان بەگەورەیەکا بێتەوە، کە بێ نەوا کەوتبێ، وە بەدەوڵەمەندێکا کە هەژار بووبێ، وە بەزانایەکا کە کەوتبێتە ناوچەن نادانێکەوە.

7-کەسێك بە منالی، دانەنیشێ لە شوێنێك کە پێی ناخۆش بێ، لە گەورەیی‌دا، دانانیشێ لە شوێنێك کەپێی خۆش بێ.

8-گەورەترین بەڵا ئەمەیە کە هیوات نەمێنێ.

9-نە لە گۆڕ ئامۆژگار تر هەیە، نە لە کتێبیش خۆشتر.

10-ووتە کە لەدڵ هاتە دەرێ ئەچێتە دڵەوە، کە لەدەم هاتە دەرێ لە گوێ تێ‌ناپەڕێ.


بە یارمەتی لیژنەی نیشتمانی ئاهەنگ گێران بە بۆنەی هاتنی
سەدەی پانزەهەمی کۆچییەوە لە کۆماری عراق لە چاپ دراوە

ناڵەی دەروون

کۆمەڵە ووتارێکی ویژەیی و مێژوویی و ئاینی و کۆمەڵایەتین

نووسراوون بەقەڵەمی شێخ :

محەمەدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاری عراق

جزمی دووەم

چاپی یەکەم

چاپخانەی ارشاد ـ بەغداد
١٤٠٦هـ ـ ١٩٨٥م

11–جەنگ سەرەتای شیرینەو دوایی یەکەی تاڵە(چونکە ئەگەر بیشی بەیتەوە هەر دۆڕاندووتە).

12–جاران مەردوم کرداریان بوو گوفتاریان نەبوو. لە پاشا وایان لێ هات ئەیان کرد، لە پاشترا وایان لێ هات ئەیان ووت و نەیان ئەکرد. ئینجا وایان لێ هات نەئەیان ووت و نەئەیان کرد.

13–هەموو جیهان جێی دووکەسی تیا نابێتەوە کە ڕقیان لە یەکبێ، لە دووبست زەویدا جێی دوو دڵداری تیا ئەبێتەوە.

## لەوێژەی کوردی‌یەوە:

1–ئەگەر زبان بیەڵێ سەر ڕەحەتە.

2–ئەگەر سەگ نەبێ گورگ ئەتخوا.

3–ئەوی بترسێ، ناخەلەسێ.

4–ئەوی بچێتە شاری کوێران، ئەبێ دەست بە چاوەوە بگرێ.

5–ئەوی لە نزیک کوورەوە بێ، پریشکی بەر ئەکەوێ.

6–برامان برایی و کیسەمان جیایی.

7–بۆز بەلەریی.

8–بەدرێژیی خۆ تا ئەڕوانییت بە پانی خەڵقیشا بڕوانە.

9–بەرخی نێر بۆ سەربڕینە.

10–پیاوی سەر ڕاست شەریکی دەوڵەمەندە.

11–بەقەد بەڕەی خۆت پێ ڕاکێشە.

12–تاماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە.

13–تۆبەی گورگ مەرگە.

14–تێر ئاگای لە برسی نی‌یە.

15–خلیسکان تۆڵەی پەلەکەرە.

16–خێر بە خوێش، نەك بەدەروێش.

17–دار کرمی لە خۆی نەبێ هەزار ساڵ ئەژیی.

18–درۆزن هەر جارێك ناشتا ئەکات.

19–دوو شووتی بە دەستێك هەڵناگیرێ.

20–دووگی چەور بێ بەلانی‌یە.

21–دەریا بە دەمی سەگ پیس نابێ.

22–دەستێك نەتوانم بی‌بڕم ماچی ئەکەم.

23–دەستی کەس پشتی کەس ناخورێنێ.

24–دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە

25–ڕازت لای یەکێك دانێ و پرست لای هەزار.

26–سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار.

27–سووك بڕۆو سەلامەت وەرەوە.

28–سەد بەرتیل قەرزێك پڕناکاتەوە.

29–سەرچۆپی بدەیتە دەست سەگ، بۆلای سەبەتەی نانی ڕائەکێشێ.

30–سەگی سپی بۆ بارخانەی لۆکە زەرەرە.

31–شوان تا دانیشێ گەلەی دوور ئەکەوێتەوە.

32–شەڕ بە چەك و مامەڵە بە پارە.

33–شەڕ لە بەتاڵی چاکترە.

34–شەڕ لە نیوەی بگەڕێتەوە چاکترە.

35–کاسە پڕ بوو لێی ئەڕژێ.

36–کاسەی پڕ ئاشتیماڵە.

37–کردن هەتا مردن.

38–کردە پەشیمانبە، نەکردە پەشیمان مەبە.

39–کە پیاو لە دوای کەرەوە ڕۆی ئەبێ بۆنی تەرسی بکات.

40–کەربارەکەی لە تفەنگ بێ گورگ هەر ئەیخوات.

41–کە لەشێریش نەبێ ڕۆژ هەر ئەبێتەوە.

42–کەشییرت وەشاند ئەبێ قەڵغانت پێ بێ.

43–کەڵەشێر لەناوەختا بخوێنێ سەری خۆی ئەخوات.

44–کەم بخۆو، مەچۆرە سەر حەکیم.

45–گا لە گاگەل بەجێ بمێنێ، شاخی خۆی ئەشکێنێ.

46–گریێ دەست مەخەرە دان.

47–گۆشتی ڕانی خۆم ئەخۆم منەتی قەساب هەڵناگرم.

48–گورگ کە پیر بوو ئەبێ بەمەخسەرەی سەگەل.

49–ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش.

50–مەردی هوشیار، دەست بە کونێکا ناکات دووجار.

51–هەر عەقڵە لە خەساریێ.

52–هەموو شتێك لە بارییکی ئەپچڕێ مێرد لە قایمی.

## سەرچاوە

ناڵەی دەروون، شێخ محەمەدی خاڵ جزمی یەکەم، چاپی یەکەم چاپخانەی ارشاد، بەغداد (1984).

کۆمەڵێك وتاری هەمەچەشن

## (1)

# کوێرێکی شاعیری بەهرەمەند[1]

بە چاوە پووچە کوێرەکانیا کە بەمادەر زادیی کوێر بوو بوو، ئەت ووت هەرچی شتە لە جیهانا نایزانێ، وە هەر لە بڕ ناکاتەوە.

بە نەخوێندەواریی و بێ ئاگاداریی یەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەت ووت هەرچی بەهرە بێ نییەتی.

کوێرێکی مادەرزادی، ڕەشتاڵەی، کونجی، بالآبەرزی، ڕەقەڵە لە ساڵی 1276هـ لە سلێمانی، لەماڵێکی، هەژاری، بێ نەوا، لە دایك بووبێ، هەموو خوێندن و خوێندەواری یەکەی، سیی جزمەی قورئان بووبێ کە بەرەشخوێنی لەبەری کردبێ، وە دەستمایەی ژیانی بووبێ، دەنگی ئەوەندە خۆش نەبووبێ، کە مەردوم خەتمەی قورئانی پێ بکەن، یا لە پرسەدا پێی بخوێنن، خۆیشی لەبەر هەژاریی و هاتوچۆی ئێران و بەردەڵبەردی کوردستان و سواڵکردن لە دیهاتانا، زۆر دەرفەتی دەوور کردنەوەی قورئانی نەبووبێ، کەچی لەگەڵ ئە مانەش ئەمەندە زیرەك و بەزەیین بوبێ توانێیتی بە پێچەوانە دەوری قورئان بکاتەوە تاسەر، وە پاشەو پاش لە ژێڵدا ئایەت بە ئایەت پیابڕوا تالە سەرەوە دەر ئەچێ کە ئەمە لە ناو قورئانا بە چاو ساغی قورئان ڕەوان ناکرێ چجای کوێری مادەر زاد.

ئەم کوێرە بێ ناو و نیشانە پیاوێکی بەهرەمەندی هەڵکەوتووی خودا داد بووە، دەروونی سیخناخ بووە لە زانین و زانیاریی، وە کاکڵباز بووە، نەك توێکڵ پەرست، هەموو ساڵێك هاوینان لەگەڵ چەند کوێرێکی تردا چووە بۆ کوردستانی ئێران، لەڕێی ژیان و نان پەیدا کردنا، پایزێکی درەنگ هاتۆتەوە، ئینجا بە بۆنەی ئەم هاتوچوونەوە، ناو بانگی زیرەکی و ووریایی و بلیمەتی وا بلاو بوو بۆوە، هەموو جارێ لەبانەو سەقز و سنەو سەردەشت و سابلاخەوە(پەردەك)"لە غەزومعما" و شیعری فارسی زۆر قورس و گران و پێچراوەیان، ئەنارده لای، بۆ لێکۆڵیینەوە و مەبەس لێدانەوەی، ئەمیش بەراستی شەن و کەوی تیا ئەکرد، وە کاکڵ و توێکڵ و کاودانی بۆ جیا ئەکردنەوە، وە بە پوختە کراوی وەك هێلکەی پاکراو، بۆی ئەناردنەوە.

ئەم کوێرە چاو پووچە ئەمەندە پڕ هۆش و گۆش بووە. وەچاوی دڵ و دەروونی روون و تییژ و بەهێز بووە، ئەوی ئەو کردوویەتی بە هەزار چاو ساغ نەکراوە. جارێ پێشەکی هەر چەند سەعاتەکەی چڵکن بووبێ خۆی لە سەردەسە سەرەکەی رووتی کردوە و هەڵی وەشاندووە و پاکی کردۆتەوە و تێکی خستۆتەوە. تەنانەت جارێکیان دەقیقە ژمێرەکەی وون ئەبێت، خۆی لە توێکڵی ڕەقی قامیش، بۆی درووست ئەکاتەوە. وە ماوەیەکی زۆر بەو ڕەنگەئیشی پێ ئەکات.

بارەها بێچووی زیوی نیشانە کراویان بۆ تێکەڵی کییسەیەك بێچووی تر کردووە دۆزیییەتەوە.

هەروا پەڕەکاغەزێکی بەرماغە جگەرەی بەنیشانە کراویی دراوەتە دەست، ئەمیش دەستێکی لێ کوتاوە لە پاشا لە ناو تۆپێك پەڕە کاغەزی جگەرەی ترا دۆزییوێتیەوە. تەنانەت ئەڵێن: کاغەزە جگەرەیەکی ئەغزە تێخراوی ئەدەنە دەست لە پاشا ئەغزەکەی ئەخەنە کاغەزێکی ترەوە. وە ئەغزەی ئەویش ئەخەنە تەمەوە وە تێکەڵی تۆپێك کاغەزی ئەغزە تێخراوی ئەکەن و ئەیدەنە دەستی. ئەمیش تێی ئەکەوێت و هەردوو پەڕە کاغەزەکە جیائەکاتەوە. لە پاشا ئەڵێ ببێ ونەبێ، یەکێك لەم دوو کاغەزەیەو ئەغزەکەیان گۆڕییوە.

لە مانە سەیر تر ئەمەیە هەر چەند کتێبێکیان دابێتە دەست، ڕووەکەی دۆزییوەتەوە، واتە ڕووی کتێبەکەی کردۆتە خۆی وەك یەکێك کە بی‌یەوێ بیخوێنێتەوە.

لەمەش سەیر تر ئەمەیە قورئانیان داوەتە دەست هەر سوورە تێکیان داوا لێ کردبێ بەقەبارەی ئەم لاو ئەولا یا دۆزییوێتەوە.

زۆر جار ئەم کوێرە ووشیارە، چۆتە کۆڕی زۆر گەورەوە لەگەڵیان دانیشتووەو لێیان پرسییوە مامۆستا چەند کەسین؟ ئەمیش ووتوویەتی ووسبن. کەمێك گوێی گرتووە، لە پاشا ووتوویەتی ئەوەندە کەسن. کە تەماشایان کردووە دەق دەرچووە.

یا لێ یان پرسیوە، ئەم ژوورە چەند داری داڕەڕای تیایە، لە پاش چەند هەناسەیەك ووتوویەتی ئەمەندە. کە تەماشایان کردووە تەواو دەرچووە!!

یاخود سێ چوار کەسی نەناسیاو وێستاوونو قسەیان کردووە، ئەم کوێری بەبییرە ووتوویەتی ئەوەیان درێژو بالا بەرزەو، ئەوەیان کورتە بالآیە. یا ئەوەیان پییرەو ئەوەیان گەنجە. بەڵام لە هەمووی سەیر تر ئەمە بووە کە گوایا جوانو ناشیرینی بەدەنگا جیاکردۆتەوە. هەرچەندە من بەمە هەرگیز باوەڕ ناکەم.

جووجەڵە کەڵەشێر- کە تازە دەستی کردبێ بەخوێندن- لە ماڵیا دزراوە لەپاش ساڵێك لە گەڕەکێکی تر بەدەنگی خوێندنیا ناسییویەتەوەو سەندوویەتەوە.

سەیر لەمەدایە تا بڵێیت دەست ڕاستو نیشان شکێن بووە. تەنانەت ئەگێڕنەوە، کە جارێك لەلادێ بزنێکی دەست ئەکەوێت ئەو ماڵەی کە ئەم تیا ئەبێت، حەوشی نابێ. شەوێ خۆیو خانە خوێکەی لەسەر کەپر ئەنوون، بزنەکە لە خوارەوە ئەبەستێتەوە بەگورییسێکەوە، سەری گوریسەکە لە سەربان ئەبەستێ بەدەستی خۆیەوە. نییوە شەو گورگێك دێتە سەر بزنەکە. کوێرە خەبەری ئەبێتەوە، بەجووڵانەوەی گوریسەکەدا عاستی گورگەکە ئەدۆزێتەوە تفەنگێکی تێئەگرێ ئەیکوژێ!.

ئەم کوێرە بلیمەتە، تا بڵێیت قسە خۆشو دەم بەپێکەنین بووە، چووبێتە هەر کۆڕێکەوە، بەپێی ئارەزووی دانیشتوانی ئەو کۆڕە قسەی خۆشو یاری خۆشی کردووە. کەس نەبووە لە یاری (شەترنج)و (دامە)دا لێی بەرێتەوە. زۆر تر چۆتە ناو فەقێیانەوە، وە هەرجارەی یاری‌یەکی وای لێ داهێناوون هەموو تیا سەرسام بوون.

جارێکیان چمکی هەردوو فەقیانەی فەقێیەک گرێ ئەدات.، لەپاشا فەقێیەکی تر دێنێ فەقیانەکەی ئەکات بەفەقیانەی ئەم فەقێیەدا، وە چمکی هەردوو فەقیانەکەی ئەمیش گرێ ئەدات. ئنجا بەرەڵلایان ئەکاتو پێیان ئەڵێ: بەبێ کردنەوەی یەکێك لەم دوو فەقیانەیە ئەتوانن خۆتان ڕزگار بکەن؟ ئەوانیش هەر چەند ئەکەن نازانن چی بکەن، لە دواییدا بریار ئەدەن کە ئەمە هەر ناگونجێ، ئنجا کوێرە دێ ئەمیان ئەکات بەکونی فەقیانەی ئەویاناو، ئەویان ئەکات، بەکونی فەقیانەی ئەمیانا، بەجۆرێك کە هەر خۆی ئەیزانێ وە هەردوکیان لەیەك بەر ئەدات، بەبێ کردنەوەی فەقیانەکان.

لەمانە لە هەمووی سەیر تر ئەمەیە لە ساڵی 1912م لە سلێمانی کابرایەکی ئێرانی کوژرا کە پێیان ئەووت -عەجەم ئۆغڵی- ئەم خوێنەیان هێنا بەسەر مەلا محمودی حاجی مەلا عبدالرحمانی دەرمان کوتو مەلا ڕشیدی برایا، کە هەردوکیان برازای شاعرە کوێرەکە مانن، لە بەرئەوە ئەم دوانە فیراریان کرد بۆ دێی (دووڕووە) لە ئێران، لە پاش چەند ساڵێك مەلا ڕەشیدیان ئەیەوێ بەدزییەوە بێتەوە، بەرەنگێکی وا کە نەناسرێتەوە، وەسەرێکی سولەیمانی بداتەوە، بۆ بینینی باوكو دایكو كەسو کاری شەو لەناو، ڕووەو قەرەداغ ئەڕوات، وە لە نییوە شەوێکا، خۆی ئەکا بەدێی (دوکان)دا، وەئەچێتە ماڵی موختار عبدالقادر مهدی. وەبێ هەست دەست ئەنێ بەدەرگای دییواخانەکەوە، کە ئەچێتە ژوورەوە تەماشا ئەکات دووکەس لەژێر لێفەدا نوستوون. لە چوونە ژوورەوەکەی ئەم یەکێکیان- کە ئەم کوێرە هوشیارە بووە- خەبەری ئەبێتەوەو سەری لێفەکەی لائەداو ئەڵێ: رشید ئەوە کەی هاتییت؟ ئەمیش لەبەرئەوەی کە بە قاچاغی هاتووە قسە ناکات. ئنجا تێ ئەخوڕێ ئەڵێ: رشید ئەوە بۆ قسە ناکەیت؟ ئەمیش ئەڵێ: بە خوا مامە ئێستا گەیشتوومەتە جێ. مەلا رشید تا مرد هەر ئەی ووت ئێستاش نازانم ئەم کوێرە چۆنی ناسییمەوە بەو نییوە شەوە، وە بە دەم خەوەوە چۆنی زانی لە ئێرانەوە گەیشتوومەتە ئەوێ، بە بێ ئەمەی کە مشەیەك یا تەقەیەك یاڕەقەیەکم لێوە بێ.

ئەم کوێرە خوادادە، گەڵ کردەوەی ئەچێتەوە سەر زیرەکی و وورییایی. بەڵام گەلێکیشی ژیریی و بیر لێی کولە، وەك ئەگێڕنەوە ئەڵێن: لە ژووری خۆی دانیشتووە لەگەڵ خێزانیا، چرکەی سەربانە کە هاتووە، لە پاش نیو سەعات دووبارە چرکەی سەربانەکە هاتۆتەوە، ئەم کوێرە بە ژنەکەی خۆی ووتووە: ئەم دوو چرکەیە یەك کچ بوو لەو سەرەوە کە هات کچ بوو. لەم سەرەوە کە گەڕایەوە بووە بە ژن.

کە ئەچنە بنج و بناوانی و باش پۆست کەندەی ئەکەن، لە پاش ماوەیەك دەرئەکەوێ کە قسەکە ڕاست بووە.

ئەم کوێرە بە هەرمەندە تابڵێیت شاعیر بووە، شیعرەکانی ئەڵێیت ئاوی ڕەوانە، هەرچی کەم و کووڕیی و قۆرت و گرێ بێ تیانیيە، کە ئە یانخوێنیتەوە، وەك تینوو بییت و پەرداخێ ئاوی ساردی سافی بێ خەوش بخۆیتەوە وایە، ووتاری لە مەبەست جوانترو، مەبەست لەووتار جوانتر، لە هەر گۆشەیەکەوە لە شیعرەکانی وورد ئەبیتەوە، نەنگی تیا نابینیت.

لە ساڵی 1331ھ شێخ حسینی چرچەقەڵا کوێرەی لە مەڕخۆمان ئەکات بەمەلای دێی(دیۆانە) بۆ مانگی ڕەمەزان تا سەر فیترەی ئەو دێیەی دەست کەوێ، هاوین ئەبێ کە پرێکی بۆ دروست ئەکەن، لە نزیك کەپرەکەی ئەمەوە، کەپری چەند جوولەکەیەکی چەرچی و خومکەر و زەڕەنگەر و خوردە فرۆشیش ئەبێ، لە بەر چەقە چەق و قلی وبلییان کوێرە ئەوڕەمەزانە نەخەوی ئەبێ و نەدەوری قورئانیشی بۆ ئەکرێتەوە، جگە لەوەی کە ئەهلی دێیە کەش هەموو نەخوێندەوار و زبر و قەبەو تورت بوون، باش خزمەتی ناکەن، وە بە تایبەتیش عەزەی برای کوێخا قادری حەمەی بارامیش پیاوێکی قسەڕەق ئەبێ، زۆر جار دڵی مەلا کوێرە ئەشکێنێ، ئنجا ئەمیش بەم بۆنەیەوە، چەکامە(قصیدە)یەکیان بۆ دائەڕێژێ، هەم کەساسی و چۆنیەتی خۆیت بۆ باس ئەکاو، وە نەخشەیەکی وات بۆ ئەگرێتە عەزەی حەمەی بارام کە تاجیهان جیهان بێ شوێنی ئەو پلارە سارێژ نەبێ، لە پاشا ئنجا تۆزێ شێخ حسینی چرچەقەڵاشت بۆ هەڵ ئەدات، سا بەڵکو ساڵێکی تر بیکات بەمەلای دێیەکی باشتر. ئەڵێ:

فەلەك، دەمێکە لەگەڵ من بەجەنگی، توبی خودا
لە حەق بترسە، بەسم پێ بنۆشە، زەهری جەفا
جەسەد تووایەوە، سەر بوو بەگەرد و شیشەی دڵ
شکا بە سەنگی فراق و شەرابی عەیش رژا
نەئەرمەنیم و، نەگاورر، نەداسنییم و نەجوو
نەشییعەم و نەمەجووسی نەملەتی تەرسا
لەبەرچی بەم رەمەزانی شەرییفە کردوومت
بەهەم نشینی سەگ و گورگ و وەحشی سەحرا
رەفییقم ئیستە لە دیی قادری حەمەی بارام
عەزەی برایەتی خالق مەگەر لە خولقی بگا
کەسیکە باغز و مونکربە ئەهلی فەزڵ و هونەر
غەرییقی بەحری جەهالەت ئەسییری نەفس و هەوا
رەفیقی غەیری ئەویشم جەماعەتیکە لە جوو
هەموو منافق و بەد شکڵ و روو رەش و رسوا
(خلیل) و (بابل) و (حسقیل) و (داود) و (اسحاق)
حسابی (خەمشە) وو (پلگێ) دەکەن لە باتی دوعا
(حەیووم) و(یەودە) وو (ناتان) و(زوکە) مدبەقچی
(قودوری) قاوەدەگیریت و(وینە) چایی ئەدا
عەمەل بە سێ شتە لەم دێیە ئیستە، یەك بەیەکی
موخالفن بە ئومووری شریعتی غەرا
بەحوکمی باتلی بی مەغز و پووچی (مووشەرەبین)
بە (سیفەتۆرە)وو (تەوراة)ی حەزرەتی موسا
منێ کە حافزی قورئانی ذاتی لەم یەزلم
خەلاتی حەزرەتی مەسنەد نشینی رۆژی جزا
کە یەعنی سیدی مورسەل محمدی عەرەبی
شەفیعی ئومەتی عاصی. ئەمینی وەحی خودا
منو ئەمانە لەیەك جێ ببینە هەمدەمی یەك
چ مەزهەبێ بە چەدینێ دروستە حالەتی وا؟
فەلەك لە زولمی لەمەوبەر هەچی گوزەشتە
وەلی بترسە لەمەولا قەسەم بەزاتی خودا
ئەگەر ئیطاعەی ئەمرم نەکەی حەوالەت ئەکەم
بەبەرقی سۆزی دلی شیخ حسینی چرچەقەڵا
کە ئەو کەسیکە شەهەنشاوو شەمعی جەمعی تروق
دلی نەهەنگ بەشمشیری (لا) دونیمە ئەکا[2]

لە هەمووی سەیر تر داڕشتنی ئەم جۆرە چەکامە دوورو درێژانەیە بەبێ نووسینو گەلاڵە کردن. شاعیری چاو ساغ کە شعر بڵێ نییو شعر نییو شعر بۆی دێ، تا ئەم نییو شعرە نەنووسێ نییو شعرەکەی تری بۆ نایەت. کە بوو بەهەشت نۆ شعر ئیتر ئاگای لە شعری یەکەمو دووهەم نامێنێ، وەئەگەر تەماشای نەکات بییری ناکەوێتەوە کەچی ووتووە، بەلاَم ئەم کوێرە، خوا نەکا، ووتەیەکی لە بییر بچێتەوە. چچای شعرێك. خۆی وەك وێنەگرو مێشکی وەك مەکیینەی فوتوغراف وایە. وێنەی هەرشتێکی گرتبێ جارێکی تر، نەشۆراوەتەوە لەسەر ڕووپەڕەی دڵی.

لەمەش سەیر تر ئەو تەشبیهانەیەتی کەپێویستن بەچاو، وە بە بێبینین و چاوپێکەوتن نازانرێن، وە بەباس و تەعریف کوێر تێی ناگات. کەچی ئەم کوێرە بلیمەتە، تەشبیهاتی وات بۆ ئەکات، کە چاوساغ هەر بۆی ناچێ. ووردبەرەوە لەم دووشعرەی کە لە چەیکامەی سەفەر بەرەکەیا ووتوویەتی کە ئەڵێ:

شەو ڕۆژە لەبەر بەرقی قلیج و رم و سونی
لەمعەی قەمەتورەش بە مەسەل بەرقی هەتاوە
جەندرمە ئەسوورێتەوە وەك واشەی برسی
بۆ لاشەی ملت بەفڕوفێڵی غەزاوە

ئەی بلیمەت تۆ چووزانی شەوڕۆژ چیەو چۆنە؟ یاتارییکی و ڕووناکی چیەو چۆنە؟ یابریقەی هەتاوچیە؟ ئەمانە وەك برسێتی و تێنوێتی و ترس و خەفەت وانە، مەردوم تاخۆی نەیان بینێ نایان زانێ.

تۆ چۆن لەمانە گەیشتییت، بەڕەنگێکی وا، کە لەشوێنی خۆیان بە کاریان بێ نیت، وە لە چاو ساغ جوانتر هەڵیان سورێ نییت، بەڕاستی ڕاست ئەکات ئەم کوێرە بەهرەمەندە کە خۆی بە خۆی ئەڵێ:

هەر چەندە کە کوێرم بەبصر وصفی قمرکەم
لکن بە ذەکا ممکنە سمعم بە بصر کەم

ئەم کوێرە ئەوەندەی لە زمانی کوردیدا شاعر بووە، ئەوەندەش لە فارسیدا شاعر بووە، وە چامەو چەکامەو تاك و جووت و پێنج خشتەکی ئێجگار زۆر بووە. بەلاَم داخی بەجەرگم هەمووی لە ناو چووە، یەکێك لە پێنج خشتەکیەکانی(تخمیسی) دوو شعری شێخ رضایە کە لە تەعریفی حەزرەتی غەوسا ووتویەتی ئەڵێ:

این منبع نورست جلای همه عین است
این جلوەی اولاد شەهی بدرو حنین است
این قصری ولی عهدی نبی الحرمین است
این بارگە حضرت غوث الثقلین است
نقد کمر حیدر و نسل حسنین است
بغداد مزین ز شعاع قمر او
فوج ملك ایستادە بهربام و دەری او
کافی ست بصد مطلب دل یك نظر او
مادرش حسینی نسب است پدراو
ز اولاد حسن یعنی کریم الابوین است

یەکێکی تر لە پێنج خشتەکیەکانی تخمیسی غەزەلێکی فارسی (مانی)یە کە زۆر بەرزە، وە شعرێکی تیایە قافیەکەی زۆر تەنگە، وە تخمیس کردنی زۆر گرانە، مەگەر بۆ بلیمەتێکی وانەبێ، کە محال لە فەرهەنگیا نیە، ئینجا تەماشا کە بزانە ئەم کوێرە ئەڵێ چی.

زلب لعل توحمدی خورد از آب بقا
پاشد از سلك (لهم) تا (حسنت مرتفقا)(3)
رخ بر افروز توو أیەی(موسی صعقا)(4)
مانی از هجر رخت أی مە فرخندە لقا
میرساند بفلك نعرەی یارب همە شب

یە کێك ئەتوانێ ئەم تخمیسە بکات، کە سیی جزمەی قورئانی وەك تەختەی(دامە) و(شەترنج) لەبەر دەمابێت، وە مانای هەمووی بزانێت.

ئەم کوێرە-وەك لە پێشەوە ووتمان-هەموو ساڵێك لە هاوینانا چووە بۆ کوردستانی ئێران، وە تاپایزێکی درەنگ دێ بە سووڕاوە تەوە بۆ سواڵ، لە کاتی خەرمانانا بۆ سەرخەمان، دووای خەرمان هەڵگرتن بۆ دیواخانان و پیاوانی گەورەی ناودار، وادیارە هەموو ساڵێ بە ناڕەزایی گەڕاوەتەوە لە دیواخانی کەیخسر و خانی سەرۆکی مەریوان، بەلاَم ئەوەندەی لە کەیخسروخان ناڕازیی بووە، ئەوەندە لە محمد امین بەگی کوری ڕازیی بووە، بۆیە بە تاقە شعرێك محمد امین بەگ هەڵ ئەداو پەڵێکیش ئەگرێتە باوکی، ئەڵێ:

نەو نیهاڵێ وا لە باخی ئەو شیاتین خصڵتا
گوڵ ئەگەر بێت و بڵێ من وەك ئەووم بێجا ئەکا

کوێری تری بە بەهرە هەڵکەوتوون وەك ئەم کوێری ئێمەیە لە ناو گەلانی ترا، بەلاَم پاش چی؟ پاش خوێندنێکی تەواو، لە زانستگای هەرەبەرزی ڕۆژانەدا، وە لە پاش خوێندنەوەی هەزاران کتێب بە زبانی خۆی و بە زبانی بێگانان، لەگەڵ ئەمیشە هێشتا ناتوانن شتێکی وا بپێکن کە چاوی پێویست بێ لەبەر ئەوە زۆر درێژ دادرن، ئەیانەوێ باسی ڕەنگێك بکەن لە ڕەنگەکان، وەك ڕەنگی سوور، بەلاَم چونکە دەرەقەتی نایەن، دەمێ لە لای ڕاستەوە بۆی ئەچن دەمێ لە پشتەوە، وە هیچ جارێ مەبەستەکە بە تەواویی نائەنگێوون، بەلاَم ئەم کوێری ئێمەیە لەگەڵ دەمی هەڵهێنانیەوە، خێرا مەبەستە کە ئەپێکی و ئەیدا بەناوە ڕاستیا، بەڕەنگێکی وا کە بەسەد چاوساغ ئەو تەشبیهەیان بۆ نەیەت.

لەگەڵ ئەمیشە کە کوێری خەڵق بە ئاسمانی ناز و نیاز ناوو نیشان و بایەو دارایی و گەورەییەوەیە، بەلاَم ئەم کوێری ئێمەیە، بە پێچەوانەی ئەوەوەیە، نە خوێندنە، نە خوێندنەوەیە، نەزانیینە، نە زانیارییە، نە ئاوەدانیەکی بەرزە، نەبوونە، نەحورمەتە، نە ناوو شۆرەتە. بەڵکو وەك ئەستێرەیەکی بێ ناوو نیشان لە نییوە شەوێکی پڕ لە هەورو هەڵادا هەڵاتووە، وە لە پاش ماوەیەکی کەم کشاوە و چۆتەوە پەردەی نەبوون.

ئەم کوێری ئێمەیە ئەگەر هەزار یەکێکی کوێری خەڵقی دەست مایەو ناوو نیشانی ببوایە ئەبوو بە خواوەندی هەموو کوێرانی سەرزەویی.

ئەم کوێرە بەدبەخنە، بە کەساسیی و، بێنەوایی، هاتە جیهانەوە وە بە هەژاریی و، گەدایی و، کولەمەرگی-ژیا، وە بەبێ ناوو نیشان دەرچوو لە جیهان وە لە ساڵی 1335هـ(1917م) لە هەڵەبجە مرد.

وە لە ژێردارەکەی (پیر محمد) دا شارڕایەوە و کرا بە ژێر خاکەوە، بەبێ ئەوەی یەکێك لە کێلی گۆڕەکەی بنووسێ: ئەمە گۆڕی شاعری بەهرەمەند(مەلا حەمدوونە).

## پەراوێزەکان

1–ئەم ووتارە لە ژمارەی 7و8ی گۆڤاری ڕۆژی‌نوێی ساڵی یەکەم بڵاوکراوەتەوە.

2–مەبەس لە لا(لا اله الا الله)یە.

3–ئیشارەیە بۆ ئایەتی(32) لە سوورەی(کهف) ئەفەرموێ(اولئك لهم جنات عدن تجری من تحتهم الانهار یحلونه فیها من أساور من ذهب ویلبسون ثیابا خضرا من سندس واستبرق متكئین فیها على الارائك نعم الثواب و حسنت مرتفقا)

4–ئشارەیە بۆ ئایەتی(143) لە سوورەی اعراف کە ئەفەرموێ(ولما جا ء موسى لمیقاتنا و كلمه ربه. قال رب ارنی انظر الیك. قال لن ترانی ولكن انظر الى الجبل فان استقر مكانه فسوف ترانی. فلما تجلى ربه للجبل و جعله دكا وخر موسى صعقا)

## سەرچاوە

ناڵەی دەروون، شێخ محەمەدی خاڵ جزمی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ارشاد، بەغداد1984


٣ شوال ١٣٥٧

# فەلسەفەی یەکێتیی کۆمەڵ و زمان (1) 2

ئادەمیی ئەگەر باش ووردببێتەوە، تێ ئەگات کە تاقە مرۆڤێکی تایبەتیی، دروست کراوە لەچەن سورو شتێکی جوێ جوێ، کەتیین و تەووژمی هەر یەکێکیان، پێچەوانەی تیین و تەوژمی ئەوانیکەی ترە، وە رێك خراوە لە چەن ئەندام و پارچەو پەڵو پۆیەك، کە ئەندازە و تەحری هەریەکێکیان جوێیە لەوییکەی تر، بەڵام گیانی ڕەوان لە ئادەمییدا ئەم هەموو سوروشت و پارچانەی بەیەکەوە بەستۆتەوە، بە ڕەنگێکی وا کە گشتیانی خستوەتە یەك وێنەوە –کە وێنەی ئادەمییە– وە هەر پارچەیەکی بۆ خزمەتێك، وە هەر ئەندامێکی بۆ کارێکی تایبەتیی تەرخان کردوە، وە هەریەکەی جۆرە جووڵانەوە و پیشەیەکی دراوە بەسەرا، وە هەریەکێکی لەو پارچانە کردووە بەخزمەت کاری هەموو جەستەکە، وە ئەندامەکانی دەرو ناوی ئامادە و خەبەردار کردووە بۆ ڕاکێشانی قازانج و سوود، وە بۆ فڕێدان و دوورخستنەوەی هەر شتێك کە زیان بگەیەنێ بەجەستە، وە لەیەکی هەڵ وەشێنێ، ئەمانەشی کە کردووە بۆ ئەوەیە کە ئەم تاقە ئادەمییە، چەن ڕۆژێك بژیی و پایەدار بێ.

تا ئەم گیانە لە ئادەمیدا بەهێزتربێ، ئەندامەکان باشتر ئیش ئەکەن، وە سوروشتە جوێ جوێکان، چاکتر یەك ئەکەوون و هەڵ ئەسوورێن، بەڵکو گیان بەهۆی هێزی کێشندە "قوەی جاذبە"یەوە، شتی بێ گیانی وەك خواردەمەنیی لە هەموولایەکەوە ئەهێنێ و ئەینووسێنێ بەجەستەکەیەوە، وە لەگەڵ ئەندام و پارچەکانیا ئەیخاتە کار و یارمەتیی ئەوانی پێ ئەدات.

هەردەمێ ئەم گیانی ڕەوانە، ڕوولەکزیی و کوژانەوە بوو، بەرە بەرە ئەم یەکێتی و یەك کەوتنی سوروشتە و پارچانە نامێنێ، وە دۆستایەتی و ئاشنایەتییان ئەبێ بە دوژمنایەتی و ناکۆکیی، بەڕەنگێکی وا لەپاش چەن ڕۆژێکی کەم هەمووی لەیەك هەڵ ئەوەشێن، وە هەریەکەی ئەچێتەوە سەر بنیاتەکەی خۆی، وە ئەو ئادەمییەی کە تا دوێنێ بوو شتی لە هەموو لایەکەوە ئەهێنا و ئەی نووساند بەجەستەی خۆیەوە، ئەمڕۆ خۆی ئەبێ بە خۆراکی مشك و مار و ئەنووسێ بەئەندامی گیانداری زیندووی ترەوە، وە خزمەتی گیان لەبەرێکی تر ئەکات، وە جەستەی قەڵەوو پتەو ئەکات.

لەپاش ئەم یەکێتیی خۆیی "وحدتی شخصی"یە ئینجا یەکێتی خێزانیی "وحدتی عائلە" دێتە پێشەوە، کە لە تاقە خانوویەکدا باوك و دایك و کورو کچ کۆبنەوە، گیانیی ڕەوان و مایەی ژیانی ئەم یەکێتییە کە بەیەکیانەوە ئەبەستێ و ئەیان خاتە گەڕ –خزمایەتیی و خوێشایەتیی نزیکە، ئەندامی ئەم کۆمەڵە بچکۆلەیە، هەرچەن بەدییمەن، هەریەکەی لە ئاوازێك ئەخوێنێ، وە هەریەکەی جۆرە ئامانج و ئارەزوویەکی هەیە، وە هەریەکە بەلایەکا هەڵ ئەسوورێ و ئییش ئەکات، بەڵام بەڕاستیی هەموو لایەکیان عەودالی یەك شتن، وەك ڕاکێشانی قازانج و سوودی خێزانەکە و دوورخستنەوەی زیان و ناخۆشیی بێ لەیەك تریی، وە هەریەکێکیان خزمەت کاری ئەواتی ترن ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئەم تاقە خێزانە چەن ساڵێك بەخۆشیی و بەیەکێتیی پێکەوە بژیین.

هەر دەمێ ئەم خزمایەتیی‌یە دوورکەوتەوە، یەکێتیی خێزانیی نامێنێ لەئارادا، ئەو حەلە ئینجا یەکێتیی تیرەیی "وحدتی عشیرت" دێتە ڕوو، کە لە ناوچە و قەڵەم ڕەوێکا، چەن خێزان و ماڵێك، بەناوی تیرە یا هۆزێکەوە، کۆئەبنەوە، گیانی ڕەوان و مایەی ژیینی ئەم یەکێتییە خزمایەتییە، چە دوور، چە نزییك، وە بەبۆنەی ئەم خزمایەتییەوە، هەموو لایەکیان خۆشەویستیی یەکترییان ئەبێ، وە دەست ئەدەنە دەستی یەك، وە بە کۆمەڵیی، هەوڵ ئەدەن، بۆ قازانج و سوودی خۆیان وە بۆ دوورخستنەوە و دەست نان بە هەموو جۆرە ئاشووبێکی ڕۆژگار و چەپۆڵەیەکی چەرخی کەچ ڕەفتار، کە ڕوویان تێ بکات، بەڵکو هێندێ جار لەگەڵ هۆز و تیرەی دراوسێشا یەك ئەکەوون و قسە ئەکەن بەیەك، وە هەمییشە هەوڵ ئەدەن بۆ سەرکەوتن و پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی خۆیان، وە بۆ دەوڵەمەندیی و دەست دارییان، ئەگەر تیرەیەکی تر یەکێکیان لێ بکوژێ، یا زیانێکیان پێ بگەیەنێ، هەموو بەجارێ ئەبن بە دوژمنی ئەو تیرەیە، وە هەوڵ ئەدەن، بۆ تۆڵە لێ سەندنی.

ئەم دەستوورەش بۆ ئەوەیە، کە ئەم تیرەیە بتوانێ لەناو تیرەکانی دراوسێیا، چەن ساڵێ، بە ئاسایش و سەربەرزیی بژیی، وە لەناویانا دەم ڕاست و سەربەرز و قسەڕەوابێ.

لەپاش ئەم یەکێتیی تیرەیی‌یە، ئینجا یەکێتیی گەلیی "وحدتی قومی" دێتە پێشەوە، وە ئەم یەکێتییەیە، گیانێکی وای نییە کە مایەی ژیانی بێ، یەکێتیی زبان نەبێ، بەڕاستیی ئەم یەکێتیی زبانە، ریشتە و شیرازەیەکی زۆر قایم، وە پەیوەندیی و پەیوەستییەکی زۆر بەهێزە، وە مایەی خۆشەویستیی و یەك کەوتنێکی زۆر بەتیینە، وە هەر زمانە کە چەن تیرە و هۆز و ئێڵێك لەم پەڕ و لەوپەڕی وڵاتەوە بەیەکەوە ئەیان بەستێتەوە، وە هەرچی تیرەو هۆز و خێڵ و نەتەوە و بنەچەیەك هەیە– کە هەریەکەی لە وڵاتێکە، و هەریەکەی لەئاوازێك ئەخوێنێ، وە هەرلایەی جۆرە ئامانج و مەبەستێکی هەیە –لەژێر یەك ئاڵادا– کە یەکێتیی گەلیی‌یە– گردیان ئەکاتەوە، وە بۆ یەك مەبەست ڕایان ئەکێشێ و ئەیان بات، وە هێزی پچڕپچڕی پەراگەندەیان کۆ ئەکاتەوە، وە هەموو بەجارێ بۆ ڕاکێشانی قازانج و سوودی تێك ڕایی کۆمەڵەکەیان، وە بۆ دەست نان بە هەموو جۆرە زیانێکییەوە تێ ئەکۆشن و قسە ئەکەن

بەیەك، تا لەپاشا کالای سەربەستیی و سەربەخۆیی ئەپۆشن، وە تاجی شاهەن شاهیی ئەکەنە سەر.

لەناو ئادەمیی‌دا ڕیشتەیەك کە بازنە "دائرە"کەی گەورە و بەریین "واسع"بێ، وە مەردومی زۆر بنووسێنێ بەیەکەوە دوو شتە، یەکەم یەکێتیی زمان کە باسمان کرد، دووهەم یەکێتیی ئایین، وە هیچ گومانێك نی‌یە کە یەکێتی زمان لە یەکێتیی ئایین هەمیشەیی "دائمی" ترە، چونکە ئەگەر ووردببیتەوە ئەبینیین هەموو گەلێك ئەوەتی هەیە تا ئێستا چەن جار ئایینی خۆی گۆڕییوە، بەلام زمانی خۆی نەگۆڕییوە مەگەر بەدەگمەن.

زۆر لە زانایانی فلسفە بەلایانەوە وایە کە ڕیشتەی زمان لە ریشتەی ئایین بەهێزترە، چونکە دوو کەس ئەگەر لە ئایینا یەك و لەزمان جویێ بن هەرگیز لەیەك ناگەن، وە بەتەواویی بەیەکتریی دڵیان ناکرێتەوە، با ساڵەهای سالیش پێکەوە بن، وە بەرامبەری یەك تریی خواپەرستیی بکەن، بەلام ئەگەر لەزمانا یەك بن با لە ئاینییشا جیابن هەر کە دەمیان گەیشتە یەك، وە بەزمانی یەك قسەیان کرد، ئیتر ئەبن بە برا، جالەبەر ئەمانەی کەووتمان، شایستەیە بۆ یۆنانی‌یەکی گاوور، بەبۆنەی یەکێتیی زمانەوە، شانازیی بکات بە (افلاطون) (ارسطو) و (سقراط)ی بت پەرستەوە، بەلام بۆ گاوورێکی هیندستانی نازێبێ، کە بەهۆی یەکێتیی ئایینەوە شانازیی بکات بە (نیوتن) و (گلیلو)ی گاوورەوە.

ئەم یەکێتیی کۆمەلایەتیی‌یە، کە لە یەکێتیی زمانەوە پەیدا ئەبێ کە بەهێز بوو، ڕۆژ بەڕۆژ، وە کەم کەم، خواه ناخوا، بێگانانی ناتەوانان ئەهێنێ و ئەیان نووسێنێ بەخۆیەوە، وە لەزبان و دەستوور و باوی خۆیان دووریان ئەخاتەوە، وە بەزبان و باوی خۆی ئارایشیان ئەدات، وە لە قازانج و سوودی خۆیا هەڵیان ئەسووڕێنێ، بەلام کە ئەم یەکێتیی‌یە بەهێز نەبوو، ئەو حەلە ئینجا ئەم ئەنووسێ بە ئەندامی گەلێکی بەهێزی تری وورریاترەوە، وە لە کوورەی ئەوا ئەتوێتەوە، وە لەڕێی ئەوا سەری خۆی دائەنێ.

ئەم هەموو قازانج و سوودەی کە لە یەکێتیی گەل و زبانەوە پەیدا ئەبێ، وە لە پێشەوە باسمان کرد، کاتێ ئەبێ کە زبانی گەل لەوانەبێ کە بتوانێ چاودێریی گەلەکە بکات، کاتێکیش زبان ئەم چاودێریی‌یە ئەکات کە هەموو زاراوەیەکی فنی‌و زانیاریی و وێژەیی ببێ، وە هەموو جۆرە ووتەیەك کە چیینەکانی ئەو کۆمەڵە لە نووسیینی و قسەو گوفتو گۆ و شعردا پێویستی بن تیابێ، کام چیین؟ ئەوانەی کە مایەی ئاوەدانی و پایەداریی و بناغەی شارستانێتین، وەك دەستەی ئەو زانایانەی کەزانیینی بەکەڵك بلاو ئەکەنەوە، وە ئەو پییشەگەرانەی کە پییشەکەیان لەمەڕ بناغەی زانیین دائەمەزرێنن، وە ئەو خاوەن کشت و کالانەی کە بەپێی زانیین بەکشت و کاڵەوە خەرییکن، وە ئەو بزانانەی کە بۆ دانانی دەستوور و یاسای جوان هەوڵ و تەقەلا ئەدەن، وە ئەو دانایانی سیاسی‌یەی کە هەمییشە چاودێریی و ئاگاداریی گەل و نیشتمان ئەکەن، وە تێکەڵی هەموو جۆرە پەیمان "معاهدە"یێك ئەبن لەگەڵ دەوڵەتانی بێگانەدا، وە ئەو شاعر و وێژەرانەی کە بەشعری ڕەنگیین و نووسیینی شیریین ڕەووشت‌و خووی جوان ئەڕوێنن لە دڵ و دەروونی کۆمەڵەدا، وە بەچرای خوێندەواریی شەوی تاریکیان بۆ ڕووناك ئەکەنەوە، وە ئەو زانایانەی کە لە زانیین پەروەریی فێرکردن "تربیە و تعلیم" پسپۆڕو سەرکەوتوون، وە ئەو بازرگانانەی کە بناغەی بازرگانی‌یەکەیان دائەنێن لەسەر بنیاتی پاشەکەوتیی ولاتەکەیان، وە ئەو بلییمەتانەی کەشتی بەکەڵك دائەهێنن و دروستی ئەکەن بۆ گەلەکەیان.

هەر گەلێك ئەم دەستە و خێزانانەیان تیا نەبێ، پێویستانی زیندەگانی یان نابووت و ناتەواو، وە بناغەی کۆمەلایەتی‌یان لەسەر با ئەبێ، وە یەکەیەکەی ئەو گەلە بەناچاریی بەگەلێکی ترەوە ئەنووسێ، وە کالای ئەو بەبەرخۆیا ئەکێشێ، بێ گومان بوون و مانەوەی ئەم چیینانە کاتێ ئەبێ کە زبانی ئەو گەلە هەموو زاراوەیەکی پێویستیی ببێ، وە هەموو جۆرە ووتەیەکی تیابێ، چونکە ئەم دەستانە بە بێ کەڵك گەیاندن و کەڵك وەرگرتن "افادە واستفادە" نابن، کەڵك گەیاندن و کەڵك وەرگرتنیش بەبێ زبانێك کە ووتمان نابێ.

کەوابوو پێویستە لەسەر زانایان و دانایانی هەموو گەلێك لەپێش هەموو شتێکا هەوڵ دان بۆ پەرەپێ‌دانی زبانەکەیان، وە بەپێی پێویستیی پییشە، ووتە لە مەبەستی زۆرا بەکاربێنن، بەلام لەگەڵ ئاشنایەتی مەبەستی بەڕاستی "مناسبەی معنای حقیقی" یا لە زبانێکی نزییك کە مناسبەی لەگەڵ زبانەکەی خۆیانا ببێ ووتەی لێ وەرگرن، وە لە جێگای خۆیا بەکاری بێنن، وە ئەگەر هەرچارە نەبوو لەزبانی بێگانان بەپێی پێویست ووشە وەرگرن، بەلام بەو مەرجەی کالای خۆیانی پێ بپۆشن، وە بیخەنە شێوە و ئاهەنگی زبانەکەی خۆیانەوە، تەماشاکەن گەلی عەرەب لەگەڵ ئەو زبانە فراوانەی کە هەیەتی، کەچی گەلێ ووتەی کوردیی و فارسیی و قبطی کلدانی وەرگرتووە، وە کالای خۆی پێ پۆشییوە، وەك ووتەی (جناح، جوز، سروال، ساذج، جوالق، بابونج، باشق، بوتقە، نموذج، جوارب، أرجوان، طازج، بنفسج، خندق، قیروان) کە وەرگیراوون لەووتەی (گوناح، گەوز= گوێز، شەڕواڵ، سادە، جەواڵ، بابوونە، واشە، بۆتە، نموونە، گۆرەویی، ئەرخەوان، تازە، بنەوشە، کەندن، کاروان).

لەمەوە دەرکەوت کە خوێندن و نووسیینی و زانیینی هەموو جۆرە زانیاری‌یەك پێویستە بۆ هەموو گەلێك بەزبانی خۆی بێ، ق و نکە تا وابێ بناغەی ئەو زانیین و زانستی‌یە لەناو ئەو گەلەدا بەهێزتر و پایەدارتر، وە وەرگرتنی ئاسان تر و تێکڕایی تر ئەبێ، وە لە مێشك و بییرا باشتر و زۆرتر ئەمێنێتەوە، وە زانایان و خوێندەوارانی دانایان و بەرزی زۆرتر ئەبن، وە دەرگای خۆش بەختیی لە هەموو لایەکەوە باش تر ئەکرێتەوە و ئەکەوێتە سەرپشت، وە بەساڵەهای ساڵ ئەو خوێندەواریی‌یەی کە هەیە هەڵ ناگییرێتەوە، ئەو گەلە ئەگەر زەبوونیش بێ و سەربەخۆییش نەمێنێ، نەوە و وەچەکانی لەپاش هەزار ساڵیش بێ، ئەتوانن لەکتێب و نووسراوی باوو باپییر و پێشیینانیان بەهرە وەرگرن، وە دووبارە گەلە مردووەکەی خۆیان زیندوو بکەنەوە، وە بەرەبەرە خۆشیی و خۆشبەختیی و بەرزیی و سەربەرزیی و، دەست داریی خۆیان بهێننەوە ژێر دەستی خۆیان.

بەلام ئەگەر زانیین و زانستی لەناو گەلێکا بەزبانی خۆی نەبوو، ئەو حەلە بەگۆڕان و تێك چوونێکی گەلەکە، وە لەچەن ڕۆژێکی کەما ئەو زانیین و زانستی‌یە هەمووی وون ئەبێ و ئەبێ بە هیچ، وە گەلەکە بە نادانی و نەخوێندەواریی ئەمێنێتەوە، وە لەکتێب خانەکانی باوو باپییریان -کە بەزبانی بێگانان نووسراوون- بەهرەیەك وەرناگرن.


لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

سەیدجەمالوددینی ئەفغانی

ئەندامی کارا : شێخ محەممەدی خاڵ

لە بەرگی چوارەمی
« گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »
دەرهێنراوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٦

نابینین یۆنای‌یەکان چونکە کتێب و نووسین و زانین و زانستی‌یان هەمووی بەزبانی خۆیانە ئێستاش، واتە لەپاش هەزاران ساڵ، وە لەدوای کزیی و زەبوونی و مردن و نەمانی فلاسفە و حکماکانیان لە تەماشاکردنی کتێبەکانیان ئەتوانن بەهرەمەند و پەند پەزێر بن، بەلاّم ئێرانیەکان هەرچەن لەکاتی ئەشکانی‌یەکانا سێ‌سەد ساڵ هەرچی کتێب و نووسین‌و زانستی‌یان بووە هەمووی بەزبانی یۆنانی بووە، تەنانەت فەرمانی پادشاهیی و سکەی زێڕ و زیویشیان هەر بەو زبانە بووە، بەلاّم چونکە زبانی خۆیان نەبووە، بە نەمانی یۆنانی‌یەکان زبانەکە نەما، وە میرات و کەلەپوورەکەیان بێ کەڵك و بێ بەهرە مایەوە.

کەوابوو ئاشکراو نمایان بوو، کە خۆش بەختیی نابێ بە بێ سەربەخۆیی، سەربەخۆییش نابێ بە بێ زبان، زبانیش پێ‌ی ناڵێن زبان تا هەرچی ووتە هەیە -کە پێویستی هەموو جۆرە خاوەن پیشەیەك بێ- بەتەواویی تیا نەبێ.

هەر گەلێك بەدووربینی بیرکردنەوە وورد ببێتەوە لە ڕۆژگاری ئاینده و ڕەووندە، وە بەووردبیلەبین "ذرەبین"ی قووڵ کردنەوە تەماشای چۆنێتیی و بەسەرهاتی گەلانی ئێستا و ڕابوردوو بکات تێ ئەگات کە لە هەموو شت پێویست تر بۆ مانەوەو بەرزبوونەوەی گەل خوێندنە لە قوتابخانە و زانستگادا و زانستی‌یە بە زبانی ئەو گەلە وە وەرگێڕانی هەموو جۆرە زانینێکی تازەیە بە زبانی خۆیان.

مەبەس کە گەیشت بەم پایەیە ئینجا ئەتوانم بڵێم ئەی گەلی کورد! کوا فەرهەنگتان؟ کوا دەستووری زبان تان؟ کوا نامەخانەتان؟، کوا گۆڤار و ڕۆژنامەتان؟ ئایا نەنگ و بەدناویی نی‌یە ئەمڕۆ چەن سیی‌پارە و نامێلکەیەك نەبێ هیچی ترمان نی‌یە بەزبانی خۆمان، لەکاتێکا کە هەموو گەلێکی تر بە سەد هەزاران کتێبی چاپ کراویان هەیە بەزبانی خۆیان؟ ئایا جێی سەرسووڕمان نی‌یە کەزانیینی تازە هەموو جیهانی داگیر کردووە، کەچی هێشتا هیچی بەزبانی کوردیی وەرنەگیراوە؟، ئایا جێ‌ی داخ و خەفەت نی‌یە کە خوێندەوارانی کورد نە کۆنەکانیان کەلەپوورێکی نووسیینان بۆ بەجێ هێشتیین، وە نەتازەکانیان شتێکیان بۆ پێکەوە ناین؟

ئایا نازانن ئەگەر زانیین و خوێندەواریی لەناو گەلێکا بەزبانی خۆی نەبێ، تێکڕایی نابێ، کە تێکڕاییش نەبوو پایەدار نابێ، زانیینێ کە بە زبانی بێگانە بێ چۆن پایەدار ئەبێ؟!! چە شانازیی‌یەك هەیە بۆ یەکێك کە هەزاران کتێب بەزبانی بێگانان لە نامەخانەکەیا ببێ بەبێ ئەوەی کە کتێبێکی تیا بێ بەزبانی خۆی؟، ئایا پیاوی ژیر شانازیی بەبێگانەوە ئەکات؟!! یا بە گەلی نادانی خۆیەوە خۆی هەڵ ئەکێشێ، کەوابوو شانازیی بەگەلە بەمەرجی بەرزیی، بەرزییش نی‌یە بەبێ زانیین و زانستی، زانیین و زانستییش کاتێك ئەبێ بە مایەی بەرزیی گەل کە تێکڕایی بێ، کاتێکیش تێکڕایی ئەبێ کە بە زبانی ئەو گەلە بێ.

**پەراوێز**

(1)بەشی زۆری ئەم ووتارە لە ووتارێکی فارسیی سید جمال الدینی افغانی وەرگێراوە، وە لە ژمارەی (9) و (10)ی ساڵی (8)ی گۆڤاری گلاوێژدا بلاّوکراوەتەوە.

**سەرچاوە**

ناڵەی دەروون، محەممەدی خاڵ، جزئی دووەم، چاپی یەکەم، (1985) بەغداد

# کۆشی دایك (1)

□ خاڵ

کۆشی دایک یەکەمیین قوتابخانەیەکە بۆمناڵ کە چاوی تیا ئەکاتەوە، وە لەوێدا فێری گرۆگاڵ و دارە دارە ئەبێ و ئەکەوێتە سەرپێ، وە لەوێوە ئەبرێ بۆ قوتابخانەی دووهەم، وە لەوێشەوە ئەچێ بۆ مەیدانی کردو کۆشیی و هەوڵ و تەقەلاو خزمەتی گەل و نیشتمان.

ئینجا ئەگەر یەکەمیین قوتابخانە- کە باوەشی دایکە- پڕ بوو لە ڕەووشت و خووی بەرز و جوان، ئەوا ڕۆڵەو جگەر گۆشەکانیش باش، وە خاوەنی ڕەووشت و خووی جوان ئەبن، وە ئەو کۆمەڵەش کە لەم لاوانە پەیدا ئەبن- کۆمەڵێکی ڕێك و پێك و بەرز و سەربەست و سەرفراز، وە هەمییشە بەسەر چڵە پۆپەی ژیانەوە وەك بلبلی هەزار داستان گۆیا ئەبن، وە بە ناو بردنیان هەزاران دڵی نەبەرد دائەچڵەکێ و ڕائەچەنێ.

وە ئەگەر -خوا نەخواستە- یەکەمیین قوتابخانەکە خراپ، وە بێ ڕەووشت و خووبوو، ئەوا ڕۆڵەو جگەر گۆشەکانیش خراپ ئەبن، وە ئەو کۆمەڵەش کە لەوان پەیدا ئەبێ پەست و پەست پەرست و بێ‌وێڵ و بێ ڕەووشت و خوو ئەبێ، وە لە نا و ئەو گە لانەی کە بۆ کوێستانی ژیان و سەرفرازیی ئەچن، ئەبن بە بەردەباز و پێ شێل.

کە وابوو کۆشی دایك یەکەمیین قوتابخانەیەکی بەرهەم هێنان و فێر کردنە، لەوێ دا ئەبێ مناڵ فێری یەکێتی و برایەتی و ڕاستی و، چاو پۆشیی و، ئازادیی و، نەبەردیی و، خۆشەویستیی نیشتمان و هاونیشتمان ببێ.

دایکی خوێندەواری ژیری تێ گەیشتوو، چەن ڕۆڵەیەکی چاکی پاکی دڵ ڕووناکی ڕاستی دڵسۆزی وریای دوور ئەندێشی چابوکی ئازای نەبەرد پێ ئەگەیەنێ بۆنیشتمان، بۆ ئەوەی کە لە پاشە ڕۆژا خزمەتی وولاتەکەیان بکەن، وەبەدڵ و بەگیان هەوڵ بدەن بۆ بەرز کردنەوەی بۆ سەر چڵەپۆپەی ژیان، وە بەشەوو ڕۆژ خەریك بن بۆ باراستنی لە چەپۆکە دەوران.

دایکی نەخوێندەواری تێنەگەیشتووش، چەن ڕۆڵەیەکی خراپی نەگریسی لاساری بەد خووی بێ ڕەووشت و خوو پێ ئەگەیەنێ، بۆ نیشتمانی بەدبەخت و گەلی خاك بەسەر، کە ئەبن بە پاچ و پێ‌مەڕە بۆ تێك دانی پایەی کۆمەڵەکەیان، وە بە شمشێرێکی زەهراویی کاری گەر، بۆ ناوچەوانی گەلەکەیان.

کەوابوو خوێندەواریی دایکەکان، واتە کچانی ئەمڕۆو دایکی پاشە ڕۆژ، لە هەموو گەلێکا-مایەی پێش کەوتنی گەلە، وەنەخوێندەوا ریشیان، مایەی بە قوڕا چوونە خوارەوەی هەموویانە.

لە ساڵی(1913)دا(سعد زغلول) لە ناو کۆمەڵێکی زۆر گەورە لە(جامعەی مصر)دا ئەوەستێ و ئەڵێت: بەگەلەکەتان بخوێنن، دەنگێ لە دوورەوە دێ ئەڵێ: نا: با دایکەکان بخوێنن، ئەو حەلە گەلیش دانا و خوێندەوار ئەبێ، وە لە خەوی بێ هۆشیی بێدار ئەبێتەوە.

ئەی دایکە خۆشەویستەکان: ئەو هەڵ کەوتووانەی کە بناغەی گەلێك دائەمەزرێنن، وە لە زانیین و، تێ کۆشیین و، شارستانێتی‌دا پێشی ئەخەن، وە لە کشت و کاڵا برەوی پێ ئەدەن، وە لە بازرگانیی و پییشەو پییشەکەریی دا سەری ئەخەن، وە بناغەو پایەیەکی وای بۆ دائەمەزرێنن کە شایستە بێ لەسەر رووپەڕەی مێژوو بە ئاوی تەلا بنوسرێتەوە، ئەوانەش ڕۆڵەیەکن وەك ڕۆڵەکانی ئێوە، وە دایکیشیان دایکێك بووە وەك ئێوە.

بەڵکو ئەو هەڵ کەوتووە نەبەردانەی کە خۆیان وەك بەردی ژێرووی بەرداش لە ژێر باری ڕۆژگارا ڕائەگرن، وە بە ماڵ و بە گیان پاسی نیشتمان و هاونیشتمانیان ئەکەن، وە هەوڵ ئەدەن بۆ سەربەستیی وسەر بە خۆیی کۆمەڵەو گەل، وە تەقەلا ئەدەن بۆ رزگار کردنیان لە چنگی زۆر و ستەمی ئەو زۆر دارانەی کە وەك هەڵۆ بەسەر لاشەیانەوە نیشتوونەتەوە و چنگیان گیر کردووە لە جەرگ و دڵیان، وە ئەیانەوێ خوێنیان بمژن و ناوو نیشانیان وون بکەن، وە پایەو نرخیان ژێر پێ بخەن، ئەوانەش ڕۆڵەیەکن وەك ڕۆڵەکانی ئێوە، وە دایکیشیان دایکێك بووە وەك ئێوە.

بەڵێ ئەو دایکانە دایکێکن لە تەحر و وێنەدا وەك ئێوە، بەڵام لە ژیریی و وێڵ و ڕەووشتو خوودا جۆرێکی ترن، چونکە ئەوان ئەزانن چۆن ڕۆڵەو جگەر گۆشەی خۆیان بە خێو، وە فێری ڕەووشت و خووی جوانیان ئەکەن، وە هەمییشە ئەیان پارێزن لە پییسی و پۆخڵی و چڵکنی و کوڵکنی و نەخۆشیی و ئەسپێوونیی، وە بە پەند و ئامۆژگاریی جوان ئارایشیان ئەدەن، وە چاودێری یان ئەکەن، وە نایەڵن لە خەت دەرچن، تا لە خەم ئەیان ڕەخسێنن، ئنجا ئەو حەلە ناچار ڕۆڵەکانیش ڕۆژ بەڕۆژ لەژیریی و بیرو وێڵ و هونەرمەندیی‌دا پێش ئەکەوون، وە هەر

لەگەنجیدا ئەبن بە پییرێکی خاوەن بییری بەرزی جیهان دییدەی قاڵی دەرهاتوو، وە ئەبن بە خاوەنی لەشی ساغ و بییری باش و دڵی پاك و گیانی ڕووناك و کردەوەی چاك.

بەڵێ ئەو دایکانە ئەزانن چۆن گوێچکە و مێشکی منالی خۆیان هەر لە شییرەخۆرەییەوە پڕ ئەکەن لە خۆشەویستی نیشتمان و هاونیشتمانیان، وە چۆن ڕۆڵەی بەرمەمکانەیان بەگۆرانی نیشتمانییەوە هەڵ ئەپەڕێنن، وە ئەیان هێننە سەما، وە ئەزانن چۆن پێویستانی نیشتمانی خۆشەویستیان تێ ئەگەیەنن، وە نەقشەی نیشتمانیان بۆ ئەکێشن لەسەر دەسرازە و سەر بێشکەیان، وەك شاعر ئەڵێ:

خەریتەی هەموو خاکی نیشتمان
دایك بە دەرزیی و دەزوو دروومان
بنووسێ لەسەر سەر بێشکەی منالْ
هەر بە نیشتمان بێتە گروگاڵ
لەبێشکەی وادا چاو هەڵ نەهێنێ
دڕۆیە هەڵ سێ تۆڵە بسێنێ

بەڵێ ئەو دایکانە هەر لە منالییەوە ڕۆڵەی جگەر گۆشەی خۆیان پەروەردە ئەکەن لەسەر یەکێتی و برایەتی و ئازایی و نەبەردیی و خۆشەویستی و دادپەرستیی و دارایی بەخت کردن، وە هەوڵ دان و کۆڵ نەدان و سەردانان.

جا هەر لەبەرئەمانەیە کە ووتمان (ناپلیون) ووتوویەتی: دایکێکی وا کە بەدەستی ڕاستیی بێشکەی منالەکەی ڕائەژەنێ، بەدەستی چەپی جیهانێ ئەلەرزێنێ.

## پەراوێز

(1)ئەم ووتارە لە ژمارەی 10و 11و 12ی ساڵی شەشی گۆڤاری گەلاوێژ بڵاو کراوەتەوە.

## سەرچاوە

ناڵەی دەروون، شێخ محەممەدی خاڵ، جزمی یەکەم، چاپی یەکەم، بەغداد 1984.






# بەهار (1)

بەهار! دیسان هاتیتەوە، لە دەست مۆتەکەی زستان و شەوەی بەفر و باران ڕزگارت کردیین، بای خۆشت دڕی دا بە هەوری تارییك و نووتەك، تیشکی زێڕینی ڕۆژ و تریفەی زیوینی مانگ و جرییوەی ئەستێرەو شیینایی ئاسمان و زەرد و سووریی کەناری ئاسۆی بۆ دەرخستین، لەلایەکەوە (حەوتەوانە) و لەلایەکەوە (کۆ) و (گەلاوێژ) و لەلایەکی ترەوە (کاروانکوژە) و (ترازوو)ت بە گومەزی ئاسمانا وەك (ئاوێزە) بۆ ئاوێزان کردیین!.

لەلایەکی ترەوە بە کڕەی خۆشی خۆت قەڵای بەفری دوژمن زستانت ڕووخاند، وە شوێنەکەیت بە لەشکری گوڵ و گیای خۆت گرت، وە خەیمە وبارەگای گوڵاڵە سوورەت لەجێ هەڵدان.

**قەڵاتی زیبوی ڕوخاوە هەرەس بەتۆپی نەسیم**

**سوپاهی لالە و گوڵ چادری لەجێ هەڵدا**

لەخۆشی ئەم زاڵبوون و سەرکەوتنە بەسەر دوژمنێکی وەك زستانا، جیهان حاڵی لێ هاتووە، شاخ و داخ و کەژ و کێوو دارو درەخت و گژوگیا و مەل و باڵندە کۆڕی ذیکریان بەستووە، وەك حەلقەی دەرویش بەدەف و گۆیندەوە بەزبانی حاڵ تەسبیحاتی خوا ئەکەن، هەر لقە گیایەك تەزبێحێکی دانەدانەی لە ئاوی شەونم لەمل کردووە، بەدەم حاڵەوە هەر سەرئەلەقێنن مەل و باڵندەش گۆرانییان بۆ ئەڵێن و سۆزیان بۆ ئەکەن، دار و درەختیش بەگەڵاکانی خۆیان دەفیان بۆ لێ ئەدەن، شاخەکانیش وەك پیرێکی دەستگیری دڵپاك لە حەلقەی ذیکری ئەم دەروێشانەدا وێستاوون بەسەر و مێزەرێکی بەفریین و باڵاپۆشێکی سەوزی ئاودامانی ڕەنگیین و سیواکێکی ڕیواسیین و چەفتە و عەگالێکی گەلایینەوە.

**چیایە شێخ و کەوا سەوز و مێزەری بەفرە**

**سیواکی چووزەرە ڕێواسە تەیلەسانی گەڤ**

**چنار و عەرعەرە دەفژەن هوزارە نەغمە سورای**

**گیاشی زاکرە تەزبیحی شەونمی لەملا**

تەنانەت گیانداری بێزبانیش لە خۆشی ئەوەی کەواپشتی گەرم بۆتەوە و سکی تێر بووە، ئارەزووی گۆرانی هاتووە، ئیتر هەر پشیلەیە ئەمیاوێنێ و: مریشکە ئەگارێنێ و، گورگە ئەلوورێنێ، ئەسپە ئە حیلێنێ و، گایە ئەقۆڕێنێ و، مانگایە ئەبۆڕێنێ و مەڕە ئەباڕێنێ و، بزنە ئەباقێنێ و، کارو بەرخە ئەباعێنێ، وە هەموو گیان لەبەرێك ئارەزووی هاوتەحرێکی خۆیەتی کە بە خۆشی لەگەڵیا ڕابوێرێ.

**لە کێوو کەژکە سەر ئێوارە دێتەوە مالات**

**لەدەوری چادری ساحیبی، مەوجی دا، وێستا**

**لە حیبلە حیبلی کەحێل و، لە باڕەباڕی مەڕان**

**لەدەنگی قوڕەیی گاجووت و، بۆڕەیی مانگا**

**لە گورگە لووروحە پەی سەگ، لە قاڕەقاڕی بزن**

**لەعەکسی دەنگی دوبارە، کە دێتەوە لە چیا**

**لە ئۆحە ئۆحەی گاوان و، قیڕە قیڕی شوان**

**لەبگرە بەردەیی کابان، دەبێتە حەشر و حەلا**

**ملائکەی سەری تاق و ڕەواقی مینایی**

**دێنە جونبوش و لەرزیین، دەکەونە ڕەقس و سەما**

لەلایەکی ترەوە کەو ئەقاسپێنێ و، چۆلەکە ئەجریوێنێ و، بلبل و ڕیشۆڵە ئەخوێنێ و قاز و قولنگ ئەچریکێنێ و گاکێویی ئەپرمێنێ و سمکۆڵ ئەکات بەڕەنگێکی وا لەگرمەی سمکۆڵەکەی، گای ژێر زەویی -کەلە پرۆپووچی کۆنا ئەڵێن: گوایە زەویی لەسەر پشتی وێستاوە- ئەلەرزێ، وە لەپرمەی دەم و لووتی گای ئاسمان -کە پرچی ثورە- ئەترسێت.

**خرنگ و هووڕی قولنگ و، قەتاری سپی لەسەران**

**کە دێت و کەو دەفڕێت و شەهێن چریکە ئەکا**

**لە پرمە پرم و لە سمکۆڵی پیرەگا کێوی**

**دەلەرزێ گاوی زەمیین و، دەترسێ گاوی سەما**

لەهەمووی جوانتر لەبەهارانا، خێوەت و دەواری کۆچەرییەکانە کە لە دەشت هەڵی ئەدەن، وە بەپانی و درێژیی کوردستان، ئێواران و شەوان، ئاگر ئەکەنەوە، وە بەقەد ئەستێرەی ئاسمان گڕی ئاگر ئەچێ بە حەوادا، ئنجا هەر وەك ئێمە سەیری ئەستێرەکانی ئاسمان ئەکەین، فریشتەی ئاسمانیش بە شەوانی بەهار سەیری گڕی ئاگری ناو ڕەشماڵەکانی کوردستان ئەکەن.

**کە هەڵ کرا شەوێ ئاگر لە کوللی ڕەشماڵێك**

**خەجیل دەبن لە زەوایای خەیمەی والا**

**(عەتارد) و(زوحەل) و (آفتاب) و (ماە)ی تەمام**

**خولاسە (ثابت) و (سیارە) تا دەگاتە (سوها) (2)**

لەمەش جوانتر، ووردە هەوری ڕووی ئاسمانێتی، کە هەر دەمەی لە وێنەیە خۆی ئەنوێنێت، دەمێ وەھ برنجۆکی سەرپۆشی بووك، دەمێ گۆڵگۆڵی وەك گوڵووك، دەمێ پەڵە پەڵەی پچکۆلە وەك مێگەلی مەڕ.

**لەژووری مێگەلی هەورو لە ژێری مێگەلی مەڕ**

**شەبیهی گوڵشەنی خضرایە، توودەیی غەبرا (3)**

ناوبەناویش پەڵە هەورەکان لەیەك ئەدەن، وەك عاشقێکی شێت و شەیدا دەست ئەکا بەگرمە گرم و ناڵەناڵ و چەخماخە و بروسکەدان، تا تاوێك باران ئەبارێت و چەن دڵۆپێك فرمێسکی سارد هەڵ ئەڕێژێت، ئنجا جیهان تازە ئەبێتەوە، وە لە هەموو لایەکەوە هاڕەهاڕی ئاودێت، وە بەقەد لاشەی گا هەڵ ئەڕژێتە خوارەوە لەدڵی دڵپاکان ڕووناکتر و لەبەفراوی سەرنزاران ساردتر، وە بە هەموو گەڵا و گوڵ و گیا و گۆپکە و چرۆیەکەوە، دڵۆپێك ئاوی سپی بریقەداری پیا دێتە خوارەوە، کە هەتاو لێی دا وەك گوارەی ئەڵماس ئەلەرێتەوە و ئەدرەوشێتەوە.

**لەگرمەگرمی سەحاب و لە هاژەیی باران**
**چیایە پڕ لە هەراوو نووایە پڕ لە سەدا(4)**
**پڕە لە سەیل و لەگوڵاوی کانی ڕووی زەمین**
**پڕە لەبەرق و بریقەی بروسکە جەووی سەما**
**شنەی نەسیمە ؛ سەدای ئاوی سافی سەرقەڵبەز**
**بە وورشە وورشە، گیا و شینکەی ڕووە شەیدا**

خۆ کە پەلکە زێڕینە پەیدا ئەبێت لەسەر ڕووی هەور بەڕەنگی زەرد و سوور و سەوز و بنەوشەیی و لاجیوەردیی و شین و پرتەقاڵییەوە، وائەزانێت کە تاقی موزەفەرە و دروست کراوە لەلایەن پەروەردگارەوە بەبۆنەی هاتنی بەهار و شایی بەهارەوە.

لەمانە لە هەمووی جوانتر ڕۆژە، کە وەك جۆلا هەر خەریکی چنینی قاڵیچەی باخچەی گوڵانە، یا وەك بۆیەچی خەریکی ڕەنگ کردنی پەڕەی گوڵانە، یەکێك بەئاڵ و یەکێك بەمۆر و یەکێك بەشینی و یەکێك ژەنگار و یەکێك بەفێست ڕەنگی، یا وەك بەربووك خەریکی سووراوو سپیاوی گوڵەباخ و نێرگس و چاو ڕشتنی گوڵاڵە و داهێنانی پرچی بنەوشە و شانە کردنی پەرچەمی بەڕەزایە، خولاسە کە تەماشا ئەکەیت، جیهان وەك بووکێکی شەنگو شۆخی ڕازاوە وایە، لە تەپڵی سەریەوە تا کەڵەموستی پێی ڕەنگاو ڕەنگ و جوان و بۆنخۆشە، وە لە هەرچی وورد ئەبێتەوە مەست و سەرخۆش، وە پڕ بەدەم پێ ئەکەنێت، یا وەك بلبلی سەرچڵ ئەچریکێنێ.

**شکۆفە درهەمی شاباشی بایی وەعدە دەکا**
**لەشەوقی مەقدەمی خەملییوە دار و بەردی چیا**
**پیاڵەی زەڕی نیرگس لەسەر کەفی سیمین**
**پڕە لە شەونمی وەك دوڕی لۆلۆ و لالا**
**گوڵیش بە پە نجەی پیرۆزی جامی یاقوتی**
**لە بۆ نیشاری موهەیایە پڕ لە زەڕی تەلا**
**لەشادیی وەك سەفی شایی لە کێوو کەژ ئەزهار**
**هوژا بە خەلقەتی گولگون، دەکەونە رەقس و سەما(5)**
**چەمەن لەلالە میسالی خەتی روخی دلبەر**
**سیاە چادری لێ بۆتە خاڵی سەرگۆنا**
**لەکن بنەوشەوو، خاوو، هەلاڵ و، بەیبوونی**
**هەلاڵی پێستەی خاوە عەبیر و موشکی خۆتا**
**چیا لە تەوقە سەری داڕژاوە تا کەمەری**
**چ زولفی سونبولی دەرهەم چە پەرچەمی بەڕەزا(6)**
**بەجۆشی ئاگری گوڵناری، کانی هەلدەقوڵی**
**میسالی دیدەیی وامیق لە حەسرەتی عەزرا(7)**

بەڵام ئەگەر ڕاستت ئەوێ لەبەهار جوانتر، ئەو خوایەیە کە بەهاری دروست کردووە، وەك خۆی لە قورئانا ئەفەرموێ (فسبحان الله حین نمسون وحین تصبحون، وله الحمد في السماوات والارض عشیا و حین تظهرون) واتە پاك و تەمییزیی بۆ خوایە لەکاتی ئێواران و بەیانینتانا، وە هەر بۆئەوە ستایش لە هەموو ئاسمانەکان و زەویدا، وە لەشەوان و نیوەڕۆیانتانا.

## پەراوێز

(1)ئەم ووتارە لە ژمارە (3)ی ساڵی (2) لەگۆڤاری ڕۆژی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.
(2)(عەتارد) و (زوحەل) ناوی دوو ئەستێرەی گەڕۆکن لەو ئەستێرانە کە پاشکۆی ڕۆژن. (ئافتاب) ڕۆژە. (ثابت) ئەو ئەستێرانەن کە گەڕۆك نیین. وە بەدرێژایی ساڵ لەبەرچاوی ئێمە ناجوولێن (سیارە) ئەو ئەستێرانەن کە بە گردی ڕۆژا ئەسووڕێنەوە (سوها) ناوی ئەستێرەیەکی زۆر بچووکە بەتەنیشت ئەستێرەی حەوتەمەوە لە (حەوتەوانە) کە بەچاوی تیژ نەبێ نابینرێت.
(3)(گولشەن خضرا): بریتییە لە ئاسمان. (توودەیی غەیرا) بریتییە لە زەوی.
(4)نووا: ئەشکەوت.
(5)هوژا: جوولا.
(6)دەرهەم: بەیەکاچوو.
(7)وامیق: عاشقی چاوەروان.

## سەرچاوە

ناڵەی دەروون، شیخ محەمەدی خاڵ، جزمی دووەم، چاپی یەکەم، بەغداد (1985).

# ژیری شێتان و شێتی ژیران

مەردوم ئەگەر بەچاوێكی وورد بوونەوە تەماشا بكات، ئەبینێ كە زۆر لە شێتەكان ژیر و زۆر لە ژیرەكان شێتن.

شێتێك بوو لە سلێمانی شەپقەی لەسەر ئەكرد، رۆژێك ژیرێك پێی ووت: تۆ- كە مسڵمانییت- چۆن شەپقەی گاوریی لەسەر ئەكەیت؟ نازانییت بەم شەپقەیە بێ بروا "كافر" ئەبییت، شێتەكەش ووتی: منێكی خوێندەواری جیهان دیدەی مسڵمانی خاوەن بیرو باوەڕ، بۆچ نەتوانم بە نوێژێك شەپقەكەم مسڵمان بكەم، ئەو پارچە پەڕۆیە بۆچ بتوانێ من بێ بروا بكات؟!!

ژیرێكی تر هەر لەشاری سلێمانی لەشێتێكی چاوخێل ئەپرسێ ئەڵێ: توخوا فیساركەس ئەوە ڕاستە ئەڵێن: خێل یەك بەدوو ئەبینێ؟! شێتەكەش كوتوپڕ ئەڵێ: بەڵێ ڕاستە، چونكە من هەرچەند تۆ ئەبینم، بەچوار پێ ئەتبینم.

شێتێكی تر بوو هەر لەسلێمانی خاوەنی كۆشێك خێزان و ماڵ و منال بوو، ئنجا ئەگەر رۆژێك نەبوونیی زۆری بۆ بێنایە، وەداوای شتێكی لە دەوڵەمەندێك بكردایە، وە ئەویش هیچی نەدایەتێ، هەر لەبەردەمی دوكانی دەوڵەمەندەكەدا دائەنیشت تا هەژارێك تێ ئەپەڕیی بەبەردەمیا، ئنجا بۆ ئەوەی پلارێك بگرێتە دەوڵەمەندەكە، وە جنێوێكی پێ بگەیەنێ، خۆی چی پێ بووایە لە پارە ئەیدا بەو سواڵكەرەی كە لەو ساتەدا تێ ئەپەڕیی لەوێوە.

هەر ئەم شێتە جارێك پێی ئەڵێن: تۆ بۆ ناچییتە لای فیسار بەگ تا هێندێ گەنم و جۆت بداتێ، ئەمیش ئەڵێ: من بۆ لای كێ بچم؟ ئەو تانجییەكانی خۆی كە ڕاویان پێ ئەكات و گۆشتیان پێ پەیدا ئەكات لەبرسانا سەر بەتەندووری گەرمی نانەواكانا ئەكەن و كولێرە ئەفڕێنن، ئێستا بەگ هیچ ناكات گەنم و جۆ بەمن ئەدات، ئەم بەگەی كە ئێوە ئەڵێن، ئەگەر وەختی خۆی كوێخای بەهەشت بووایە، بۆچ ئادەمی باپیری سیی‌و دوو دانەی دەربهاتایە، ئەیهێشت مێلاكی ئەو دەنكە گەنمەی بكردایە كە خواردی و لەسەری دەركرا؟!

مێژوو بۆمان ئەگێڕێتەوە، كە ڕۆژێ هاروونە ڕەشید لە قەراخ شاری بەغدا بە دوو شێت ئەگات، یەكێكیان باڵووڵ و ئەویتریان شێتێكی هاوڕێی باڵووڵ ئەبێ، هاروونە رشید بە باڵووڵ ئەڵێ: تۆ بۆچی ناونراویت بە باڵووڵ؟ ئەمیش ئەڵێ: ئەی تۆ بۆ ناونراوییت بە هاروون؟ لەمە هاروونە رشید توورە ئەبێ، دەست ئەكات بەجنێودان بە باڵووڵ، باڵووڵ ڕوو ئەكاتە هاوڕێكەی خۆی ئەڵێ: ئێمە كە لە بغدا دەرچووین دوان بووین، كەچی وابووین بەسێ(1).

جارێكیان پیاوێكی گەورەی دەم ڕاستی بەدەسەڵات ئەچێتە تیمارخانەیەك بۆ سەیری ئەو شێتانەی كە لەوێدان، لەناو هەموویانا كە ئەیان دوێنێ یەكێكیانی زۆر بەژیر و لەسەر خۆ و قسەخۆش دێتە بەرچاو، ئەمیش ئەو یەكە دەرئەهێنێ لە تیمارخانەكە، وە لەگەڵ خۆی ئەیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئێوارێ مێز و مەزە و خواردن و خواردنەوەیان بۆ دائەنێن، كابرا لەگەڵ شێتەكەدا دێنە سەرمێز، وە خاوەن ماڵ دەست ئەكات بەخواردنەوە، تەماشا ئەكات شێتە ناخواتەوە، پێی ئەڵێ: بۆ ناخۆیتەوە؟ ئەڵێ: تۆ ئەخۆیتەوە بۆ ئەوەی وەك منت لێ‌بێ، ئەی من بخۆمەوە بۆ ئەوەی وەك كێم لێ بێ؟ كابرای ژیر لەسەر ئەم قسەیە دەست لەخواردنەوە هەڵ ئەگرێ.

ژیری شێتان هەموو ئێسكیان سووك و گیانیان پاك و دڵیان ڕووناك و زمانیان شیرین و قسەیان خۆشە، لەبەر ئەوەی كە كەس هیوای ئەم جۆرە قسانەیان لێ ناكەن، بۆیەوا ئێجگار قسەكانیان خۆشە لە گوێچكەدا، بەڵام ژیرەكان چونكە هەمیشە چاوەڕوانیی قسەی ژیرانەیان لێ ئەكرێ، ئەگەر قسەكەیان زۆر بەرز و بەنرخ نەبێ، بەشتێكی هیچ و پووچ وەرئەگیرێ.

### پەراوێز

(1) واتە دوو شێت بووین كەچی وابوو ین بەسێ شێت چونكە هاروونە رشیدیش وەك ئێمە شێتە.

### سەرچاوە

ناڵەی دەروون، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپی یەكەم، جزمی یەكەم، چاپخانەی ارشاد بەغداد، (1984).

# بووك و خەسوو



ئەوەتـەی جیـهان جیهانـە، ئـەم دوانـە وەك ئـاگر و پوشـوو وانـە، بـە دەگمـەنیش نـەبووە بێقـڕە دانیشـن، ئاخرێکەی هەر بووە بە ئاژاوە و ماڵیان لێ بووە بە کونە مشـك، ئینجـا سـایا بـووك تـۆراوە، یـادایك تـۆراوە، یاهـەردوکیان تـۆراوون، وە کـوڕی بەدبـەخت، سـەر گـەردان و مـاڵ وێـران، وە بـێ چـارە و بـێ دەرەتـان ماوەتەوە، نەیزانییوە چی بکات و چۆنیان ڕێك بخات، دەمێك شاڵاو ئەبات بۆ ژن و کەس وکاری، دەمێك هانە ئەباتـە بـەر دایـك، دەمێـك دەسـت ئـەکات بـە پشـتێنی ناسیاو و دراوسێدا، دەمێك لە خوا ئەپاڕێتەوە و هەڵ ئەنووزێت کە دەروویەکی لێ بکاتەوە، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ بێ هیوا تر و نائومێدتر ئەبێت و منالّ پەرەوازە ئەبێ و ئەکەونە کۆڵانان، وە یا دایك دەرئەکرێ و دەست ئەکات بە سنگ کوتـان و هـەڵنووزان، ئەمـە بۆچـی؟! وە ئەمـە تاکەی؟!!

هەموو لایەکمان ئەزانیین خەسوو- کەدایکی کوڕە- کوڕەکەی خۆی لە سکیا بەرهەم هێناوە، وە لـە خوێنـی خۆی بناغەی لەشی داڕشتووە، لە پاشا هەر لەسکیا بە خوێناوی خۆی پەروەردەی کردووە تا بوویەتی، ئینجا بە شیر- کە هەر لـە خوێنەکەی پەیدا ئەبێت- گۆشـی کـردووە و پێـی گـەیاندووە، وە هەمییشـە بـە دیـار بێشـکەکەیەوە بـووە، نـەوەك بێـدار بێتـەوە، یـا ئەگـەر برسیی بوو خێرا شـیری بداتـێ، ئـەوها بـە دیاریـەوە شەو نخونیی کردووە تا بەیانی، کەپێشی گرتووە چۆن چۆنـی پـێی گرتـووە؟ ئـەم دایکـە هەنگاوبـە هـەنگاو بردوویەتی بەڕێدا وە دارە دارەی پێ کردووە، تا سامی شکاندووەو فێری ڕۆینـی کـردووە، ئینجـا وەرە فـێری قسەو گوفت و گۆشی بکە، وتـە بـە ووتـە بیخـەرە سـەر دەمی، تاوای لێ دێت فێری قسە کردنیش ئەبێت.

لە پاشا هـەر چەند ئەم منالّە چووبێتە نـاو منـاڵان دایکی دڵێکی لە لای بووە، چۆن دڵێك؟ دڵێکی وا ناوبـە ناو هـەر لـە خۆیـەوە داچڵـەکیووە و، وای زانییـوە کـە کوڕەکەی گریاو دەنگی هات، خێرا وەك شێت هـەڕای کردۆتە دەرەوە بە شوێن یا، کە تەماشای کردووە کوڕ یـاریی ئـەکات و نـاگریی، وە ئـەم گوێچکـەی زرنگاوەتەوە، هـەر چەند کـوڕە پەنجەیـەکی گـەرم بـوو بێت، ئەم ئاگری تێ بەربووە یا شوێنێکی هاتبێتە گل، ئەم خێرا دڵـی هاتۆتـە کـوڵ کـوڕە گـەورە بـووە و پـێ گەیشـتووە، ئینجـا دایـك کەوتۆتـە خولیـای ژن بـۆ دۆزیینەوەی بێ ئەوەی کوڕ ئاگای لێ بێت، هـەر چەند کچێکی جوانی دیبێت، لێی وورد بۆتەوەو چەوتـــەو

چییلەی گرتۆتەوە، سا بەڵکو دڵی بیگرێ و شایستەی کوڕەکەی بێت، کام کوڕ؟ ئەو کوڕەی کە لەبەر دڵی خۆی لە هەموو کوڕێك ژیبر ترو بە بییر ترو زانا تر و دانا ترو جوان ترو لاو چاکترو خۆشەویست ترە، بەڕەنگێکی وا کە زۆر جاروا ئەزانێت کە هەرچی کچی ئەو ناوچەو مەڵبەندە هەیە هەموو بە تەمای کوڕەکەی ئەوون، وە هەر کچێك کە قسە لەگەڵ ئەم بکات بۆ ئەوەیە کە بەڵکو خوا بکات بەر دڵی بکەوێت و هەڵی ببژێرێت بۆ هاوسەریی کوڕەکەی، لە پاشا هەر کچێکی هەڵبژارد ئەوە بە گەورە ترین خزمەت ئەزانێت بۆ ئەو کچە، لە پاش ئەوەی کە کچەکە گوێزرایەوە، ئییتر دایکە هەناسە ساردەکە چاوە ڕوانیی ئەوە ئەکات کە بحەسێتەوە، وە بەری هەوڵ و تەقەلای خۆی ببینێت، وە پاداشی ئەم هەموو ئازاروسزاو دەردی سەریی و شەو نخونی و چنگڵە چزێیەی کە کردوویەتی و چەشتوویەتی لە پێناوی پێکەیاندنی کوڕا ببینێت، وە کوڕ و کچ بەجووتەلەدوای خوا تەماشای ئەم دایکە بکەن، کە ئەوەندەی ماف هەیە بەسەر کوڕەکەوە ئەوەندەش مافی هەیە بەسەر کچەکەوە، کەوا بەری ڕەنجی چەندساڵەی خۆی داوەتە دەستی، وە ئیتر هیچیان بەبێ ئەم پەنجە نەکەن بە ئاوا.

ئینجا با بێینە سەر باسی بووك، ئەمیش تا دوێنێ بووە، کچێکی خۆشەویستی باوك و دایکی خۆی بووە، وە هەمیشە دڵیان وەك پەروانە بە دەوریا سووڕاوەتەوە، باوك و دایکی ئەگەر لە براکەیان دابێ لە سەر شتێك، هەرگیز دڵیان نەهاتووە جارێك لەم کچە بدەن، یا دڵی بشکێنن، لە پاشا بەرە بەرە ئەم کچەش بە هەزاران ناز و نیاز گەورە بووە، وە ئارەزووی ژیانێکی پڕ لە ئازادیی و سەربەستی کردووە، نەخوازەڵا کە لە ماڵی باوکیشی تۆزێ دەست بەسەربووە، وەبارەها حەزی کردووە کە ماڵ و حاڵێکی ڕێك و پێکی ببێت، وە خۆی گەورە و کەیبانووی ماڵی خۆی بێت، وە هەر خۆی فەرمان دار و فەرمان ڕەوا بێت، وە هەر چەند ئاشناو ئاوەڵەکانی جارانی هەیە، کە هاتن بۆ لای بە مییوانیی بچێت بە پیییریانەوە، وە تێر و پڕ خزمەتیان بکات، وەك دایکی کە هەر خۆی حساب بووە لە ماڵی باوکیا.

ئینجا بەم هەموو ئاواتو ئارەزووە وە کە لە دڵیایەتی کچە ئەگوێزرێتەوە بۆ ماڵی مێردی، لەم حەلەدا کە وورد ئەبێتەوە، ئەبینیت لە لایەکەوە خەسوو خۆی هەڵگرتووە بۆ گەورەیی و فەرمان داریی، کە بەبێ ئەو کەس پەنجە نەکات بە ئاوا، وە بۆ هەموو شتێك پرسێکی پێ بکرێت، لە لایەکی تریشەوە بووك وەك مەلێك کە لەقەفەس بەربوو بێت، وە وەڕس لە هەموو دییلی و دەست بەسەرییەك، ئەیەوێت بابۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، بە ئازادیی و سەربەستی بژیی، کەچی لە پاش چەند ڕۆژێك کە چاو ئەکاتەوە، تەماشا ئەکات دنیا بەجۆرێکی ترە، وە ئەو هەموو ئاوات و هیواو ئارەزووانەی کە ساڵەهای ساڵە خۆی بۆ هەڵگرتووە، هیچی نەهاتە دیی، وە هەمووی وەك بڵقی سەرئاو بابردیی، ئەگەر جاران لە ماڵی باوکی سەربەستی یەکەی لەناو چوار چێوەیەکا بووبێت، ئێستا لەناو دووسێ چوار چێوەدایە، وە هەمیشە خەسووی وەك سێبەر بە دوایەوەیەو لێی جیانابێتەوە، چاوێکی لێ ئەکات بەچوار چاو، وە گوێی هەڵ ئەخات بۆ هەموو چرکەو سرپەو وورتەو خرتەیەکی، لە هەموو هەستان و دانیشتنێکا قسەیەکی تیا ئەکات، تا ماڵی لێ ئەکات بە چەرمی چۆلەکە، خۆلاسە لەلایەکەوە بووك بە جوانیی و گەنجی خۆی ئەنازێت، لەلایەکیشەوە خەسوو بەپییریی و سەرسپێتی خۆی ئەنازێت، ئنجا لێرەوە ساردو سڕی دەست پێ ئەکات، نەخوازەڵا کە بووك و خەسووش زۆر لەیەکەوە دوورن، چ لە ژییریی و بییرا، چ لە تەمەن و ئامانج و خەباتا، ئنجا ئەگەر یەکێکیان زۆر زۆر ژییرو بەبییرو هێمن و خوێن ساردو لەسەر خۆ نەبێت پەنا بە خوا لە پاش دوو سێ مانگ ئەبێ بە چ جەنگ و ئاژاوەیەك، دیارە هەموو کەسێك وا چاوەڕوان ئەکات کە ئەو یەکە خەسوو بێت، چونکە هەم بەتەمەن گەورەیە، وەهەم ڕۆژێکیش بووە کە خۆی بووك بووە لەبەر دەستی خەسوو یا، هەروەك چاوەڕوان ئەکرێ لە بووکە کەش کە بە چاوی دایك تەماشای خەسووەکەی بکات، وە دان بنێت بەو هەموو مافانەی کە هەیەتی بەسەر کوڕەکەیەوە.

خولاسە ئەگەر خەسوو تەماشای بووکەکەی وەك کچی خۆی بکات، وە چەند پلەیەك لە ئارەزووی ژنانەی هیچ و پووچی خۆی بێتە خوارەوە، وە بووکیش بەچاوی دایك تەماشای خەسوەکەی بکات، وە چەند پلەیەك بێتە خوارەوە لەو ئاواتانەی کە هەیەتی، هەردوو لا لە نییوەی ڕێکا ئەگەن بەیەك، وەدەست ئەخەنە ناو دەستی یەکەوە، وەك دایك و کچ. وە هەرچی ناخۆشیی و دووبەرەکی و ئاژاوە یەك هەیە، وەك مردوو ئەی نێژن و ئەیکەن بەژێر خاکەوە، بەڕەنگێکی وا ئەگەر مردوو بەتەمای ڕۆژێکی زیندوو بوونەوە بێت، لە ڕۆژی دوایی دا کەسەر دەربێنێت لە خاك، دوژمنایەتی ئەم دوانە ئەو ڕۆژەشی لە دواوە نەبێت، وە جارێکی تر سەر بەرز نەکاتەوە، بەڵام ئەم بووك و خەسووە لە کوێ بێنیین؟

## سەرچاوە

نالەی دەرون، شێخ محەممەدی خاڵ، جزمی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ارشاد، بەغداد (1984).

# درۆی نیسان

مەردوم ستەم لە نیسان ئەکەن کە ئەڵێن: (درۆی نیسان)، وەك لە مانگەکانی ترا درۆ نەکرێت وایە، لەگەڵ ئەمییشە کەلە هەموو کاتێکا وە لە هەموو شوێنێکا درۆ ئەکرێت چ بەگوفتار، چ بەکردار، چ بەئاشکرا چ بەپەنهان، لە ماڵی ژن لەگەڵ مێرداو مێرد لەگەڵ ژنا درۆ ئەکەن، هەردوکیان لەگەڵ مناڵەکانیانا درۆ ئەکەن، مناڵەکان لەگەڵ یەکترییدا درۆ ئەکەن، هەموو لایەکیان لەگەڵ نۆکەرو کارەکەرا درۆ ئەکەن، ئەمانیش لەگەڵ ئەوانا درۆ ئەکەن.

لە کارگەدا کرێکار لەگەڵ خاوەن کارگەدا درۆ ئەکات، خاوەن کارگەش لەگەڵ کرێکارەکانیا درۆ ئەکات.

بازرگان لەگەڵ هەموو گەزێکا کە ئەیفرۆشێ درۆیەك ئەکات، خاوەن ترازوو لەگەڵ هەموو کێشێکا درۆ ئەکات.

هەروا هەموو دەستەو هاوپییشەیەك لە ئاسنگەرو دارتاشو بەرگ دروو سەوزە فرۆش درۆ ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە هاتوچۆیان ئەکەنو ئیشیان پێ ئەکەن هەر لە بەیانییەوە تا خەو ئەیان بات بەلادا.

دائرەکان پڕن لە درۆ، سەرۆك لەگەڵ خوار دەستی خۆی درۆ ئەکات، خوار دەست لەگەڵ سەرۆکا ئەکات، هەردولا لەگەڵ خاوەن ئیيشا درۆ ئەکەن،، سەر بەهەر دائرەیەکا ئەکەیت وائەزانییت کارگەی درۆیە، وە لە رۆژێکا سەد هەزار فەردە درۆت بۆ هەڵ ئەڕێژن.

خۆ ئەگەر گوێ لە پیاوی سیاسی بگرییت، ئەوە هەر پەنا بەخوای ئەوێت، چونکە یەك هەناسی لە سەریەك قسە نامێنێتەوە، هەر دەمە بەپێی سیاسەتی ئەو رۆژە قسە ئەکات، خوا نەکات دڵو زمانی ئاگایان لە یەکتریی بێت.

داگییر کردن "احتلال" ناو ئەبات بەئاوا کردنەوە. "استعمار"و، نادانی بەدانایی و، هەژاریی بەدەوڵەمەندیی و، نەخۆشیی بەساغی و، دوژمنیی بەدۆستایەتی و، تالاّن کردن بەیارمەتی و دەست گرتنو، وێرانی بەئاوەدانی و، ئاژاوە بەئاستیشو، نائەمینی بەئەمینی و دڵنیایی و، بێ ڕەووشتو خوویی بەشارستانێتی و، خراپی بەچاکی و، چاکی بە خراپی و، جەنگ بە ئاشتی و، ئاشتی بە جەنگ و، دواکەوتن بە پێشکەوتن و، مردن بە ژیان.

بییرمان نەچێتەوە درۆ و دەلەسەی ئەحزاب لەگەڵ یەکتریی دا کە هەریەکێکیان بۆ گەیشتن بە پایەو کورسیی هەزاران درۆ ئەکەن لەگەڵ کۆمەڵەدا، وە هەزاران بەڵێنی درۆی پێ ئەدەن، تاسەر ئەکەوون، وە لە سەر کورسی یەکە دائەنیشن، ئەو حەلە ئیيتر گەزی چیو جاوی چی؟ هەریەکە ناڕەوایی خۆی بە ڕەواو، ڕەوای ئەوییکەی تر بە ناڕەوا ئەداتە قەڵەم، بەڵکو تاقە یەك شت ئەگەر ئەمیان بیکات ڕەوایەو ئەگەر ئەویان بیکات ناڕەوایە.

خۆ پرسیار هەرمەکە لە درۆی مێژوو، مەگەر بە هەڵە ڕاستێکی تیا بێت، مێژوونوسی ئەمیان هۆی جەنگ ئەداتەپاڵ دوژمنەکانی، دوژمنەکانیشیان پاڵی ئەدەنە پاڵ ئەمان، لە پاشا هەردولا هەموو جۆرە درۆیەکی زل ئەکەن لە پێناوی چاوو ڕاوێکا، وە هەرچی بۆ خۆیان بە باشی بزانن بە جوانیی و قەشەنگیی ئەی هۆننەوە، وە هەرچییش بۆ خۆیان بە خراپی بزانن هەزار کالاّی ڕەشی ئاو دامانی ئەکەن بەبەرا بۆ دوژمنە کانیان.

تەنانەت مەردوم خۆی درۆ لەگەڵ خۆی ئەکات، بەم ڕەنگە پییرەو کەچی سەر و سمێڵ و برۆی ڕەش ئەکاتەوە، وە تەمەنی خۆی پچووك ئەکاتەوە.

یاخۆ ستە ملە مەردوم ئەکات و کەچی خۆی بە مسڵمان و دادپرس ئەداتە قەڵەم، یاکارێکی خراپ ئەکات کەچی وانیشان ئەدات کە کارێکی چاکی کردووە، یا ئیشێك ئەکات هەر بۆ قازانجی خۆی، کەچی وانیشان ئەدات کە بۆ قازانجی گەل و نیشتمانی کردووە، یا ئیشێکی زۆر خراپ و ناشیریین ئەکات کەچی خۆی ئیخفال ئەکات کە ئەم ئیيشە ناشیرییینە لە فلاّن ڕووەوە چاکە، وەك کابرا کە گەورە ترین زانای ئاییني و چاکترین پێشەوای دینی دەرکرد لەسەر مزگەوتەکەی، وە یەکێکی نەخوێندەواری پییسی بۆگەنی دانا لە جێگاکەی، کە لێیان پرسیی لە هۆکەی، ووتی ئەویان زۆر زاناو داناو بە حورمەتە لە هەموو شوێنێك دائەمەزرێ و جێگای ئەبێتەوە، بەلاّم ئەمیان خوێڕییە ئەگەر لەسەر مزگەوتێك نەبێت خوێڕیی تر ئەبێت.

تەنانەت بەرتییل خۆر خۆی ئیخفال ئەکات بەم ڕەنگە ناوی بەرتییلەکە ئەبات بە دیاریی، وە فێڵباز ناوی فڕوفێڵەکەی خۆی ئەبات بە زییرەکی و ووریایی.

کەوابوو ئەم جیهانە بناغەی لەسەر درۆو دەلەسەیە، هەر چێکی تیایە درۆزنە، درۆ ئەکەن لەگەڵ خۆشیان و لەگەڵ گەلیشیانا. ئەگەر مرۆڤێك بتوانێ درۆ نەکات، وە ڕاستگۆ بێ لە هەموو گوفتار و کردارێکیا، ئەو حەلە بێ کەس و بێ هاوڕێ ئەمێنێتەوە، بەڵکو هەموو کەس بە شێتی دائەنێت، کە وابوو ئەمەشمان هەر درۆیە کە ئەڵێن: درۆی نیسان، چونکە هەموو ڕۆژێك لای ئێمە هەریەکی نیسانە بۆ درۆ کردن.

**سەرچاوە**

ناڵەی دەروون، شێخ محەمەدی خاڵ، جزمی یەکەم، چاپخانەی ارشاد، بەغداد1984.

# دوا دیداری زانا و ئەدیبی کورد شێخ محەمەدی خاڵ

ئا/بەختیار سەعید

*بەمەبەستی دروست کردنی ئەرشیفێکی تایبەت بە ئەدیبان و نووسەران و هونەرمەندانی کورد، شێوەکار(خالید رەسول) بە هاوکاری وێنەگر (بەشارەت جەمال) دیدارێکی تایبەتیان لەگەڵ زانا و ئەدیبی گەورە(شێخ محەمەدی خاڵ) سازداوە.*

*دیدارەکە رۆژی 1987/9/23 لەگەڕەکی سابونکەران لە ماڵی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ سازکراوە، لەو دەمەی کە مامۆستا بۆ دووساڵ لە بینینی لە دەست داوە و زاکیرەی بەرە و کزی و پەینەبردن بەرابردوو دەچوو، کە زیاتر لە 60ساڵ ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتکردن بەئەدەبی کوردی و لەو نێوەندەدا(26)بەرهەمی هەمەڕەنگی بە چاپ گەیاندووە کە هەندێکیان(ئاینی، کۆمەلایەتی، وێژەیی و ئەدەبی، نیشتمانین)*

***سەرەتا حەزدەکەین بەناساندنی ژیانی بەڕێزتان و نازناوی خاڵ لەچییەوە هاتووە دەست پێ بکەین؟**

–خێزانی ئێمە لەسەرەتادا لە شاری مەریوان دانیشتوون و باوك وباپیرمان بە گشت شێوەیەك لە خزمەتی گەلی کوردا تێکۆشاون، نازناوی خاڵ لەوەوە هاتووە کە شێخ محەمەدی خاڵ کە باوکی حاجی شێخ ئەمیر بووە و پەیوەندی لەگەڵ شێخ محەمەدێك هەبووە لە هەڵەبجە کە هەردووکیان شێخ محەمەدیان پێوتراوە، کە مامۆستای قوتابخانە بانگی کردوون هەردووکیان هاتوون، بۆ لێك جیاکردنەوەیان باپیرمی ناو ناوە شێخ محەمەدی خاڵ و ئەوی تریش شێخ محەمەد، بۆ خۆشم لە ساڵی 1904 لە دایك بووم و سەرەتای خوێندنم لە ناو شاری سلێمانی دابووە لەلای شێخ جەلالی قەرەداغی درێژەم بە خوێندن داوە لە تەمەنی 15ساڵاندا بووم کە خێزانم پێکەوەناوە و ئێستاش سێ کچم هەیە لەگەڵ خالید.

***چۆن بوو لەتەمەنێکی سەرەتاییەوە رووتان لە دنیای ئەدەب و نووسین و وەرگێڕان کردووە؟**

–لە سەرەتاوە خۆم زۆرم حەز بە خوێندن و نووسین دەکرد و زۆربەی ئیلهامەکانم لە (سەید جەماله دینی ئەفغانی)یەوە وەرگرتووە، چونکە بەردەوام دەمخوێندنەوە، کەلەوتەیەکدا دەڵێت(هەر گەلێك فەرهەنگی نەبێت گەل نییە) هەر ئەوش بووە هۆی ئەوەی کە دەستم بەوشە کۆکردنەوە کرد و فەرهەنگی خاڵم بەرهەم هێنا.

***لەبواری فەرهەنگی و ئاینیداکامیان زۆرترین پانتاین داگیرکردووە لە لاتان؟**

–زیاتر لە ڕووی ئایینەوە تەفسیری قورئانم کردووە و ئیلهاماتی ئاینییم زۆرە.

***جگە لە کتێبە چاپکراوەکان چ بەرهەمێکی دەستنووستان هەیە؟**

–نالەی دەروون بەرگێکی چاپکراوە و دوو بەرگی ماوە پێشەکیەکەم بۆ دیوانی شێخ رەزای تالەبانی نووسیوە کە 37لاپەڕەیە کە بەشێوەی زۆرجوان نووسیوومە.

لەتەواوکردنی بەرگەکانی فەرهەنگی خاڵدا کەس یارمەتی داون؟

***لەدوای خۆم مەمنونی مەلا محەمەدی کوردیم زۆر یارمەتی داوم لەزۆر لایەنەوە، لەوانە لەموفرەداتدا یارمەتی داوم و قەرزار باریم.**

**لەدوای تەواوکردنی خوێندن لەچ فەرمانگەیەك دامەزراون؟**

–لە ساڵی 1940دا بوومە قازی هەڵەبجە لە هەمانکاتیشدا حاکمیش بووم، دواتر گواسترامەوە بۆ چەمچەماڵ و پاشان بۆ سلێمانی و کەرکوك، دواجاریش بۆ سلێمانی و پاشان کرامە قازیی یەکەم لە موسڵ و لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا، بوومە ئەندامی ئەنجومەنی تەمیز لە بەغداد کە دووساڵ درێژەی هەبوو، پاشان گەڕامەوە شاری سلێمانی.

***بەڕێزتان بوونە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد و ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد بوون ئەمە لەچ ساڵێکدا؟**

–لە سەرەتای پەنجاکانەوە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقی بووم و پاشان بوومە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد، تا ئەمدواییە کە کۆڕی زانیاری کورد تێکەڵ بەکۆڕی زانیاری عێراقی کراو لەو ساتەشدا وەك ئەندامێکی باڵای ئەو کۆڕی زانیاری عێراقییە بووم. لە تشرینی یەکەمی 1970 بەسەرۆکی لقی سلێمانی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی هەڵبژێردرام.

***لە شاعیرانی سەردەمی خۆت چ شاعیرێك سەرنجی زۆر راکێشاون؟**

–پیرەمێرد.. پیرەمێرد شاعیرێکی گەورە بووە، بێخودیش شاعیرێکی زۆر باش بووە کە شیعرەکانی تامی شیعرەکانی نالی دەدات.

***لەگەڵ ئەمین زەکی بەگ و رەفیق حیلمیدا هیچ یادەوەرییەکتان هەیە؟**

–ئەمین زەکی بەگ هاوڕێی باوکم بووە و پەیوەندیەکی پتەویان هەبووە.

***دەربارەی قانع؟**

*(قانع)م زۆر بەلاوە سەیر بووە، هەربۆیە دەمووت خۆزگە سامانێکم هەبوایە و (قانع)م بانگ بکردایە و ژیانیم دابینبکردایە و بموتایە فردۆسیم بۆ بکە بە کوردی، کە هەمووی مێژووی کۆنی ئێرانی تیادا باس کراوە و بە ئاسانی دەیتوانی ڕۆژانە مەلزەمەیەکی لێ تەرجەمە بکات، ئەوەندە رەوان بووە، هەروەها پەیوەندیمان زۆر باش بووە.

***ئەی مامۆستا (گۆران)ی شاعیر؟**

–گۆرانی شاعیرم زۆر خۆش دەوێت.

***بیرەوەرییەکی خۆشتان هەیە لەگەڵ پیرەمێردی شاعیردا؟**



—نازانم پیرەمێرد فریشتەیەك بووە بۆ خۆی، ئەو قەڵەمەی کە دەگرتە دەست یەك دەست و خەتی هەبوو کە زۆر خۆش بوو، هەر کاتێك شیعرێکت پێبدایە راستەوخۆ بۆی دەکردیت بە کوردی کە ئەوەش سیفەتێکی زۆر سەیر بوو.

***لەرۆژنامە کۆنەکاندا لە چ رۆژنامەیەکدا بەرهەمتان زیاتر بڵاوکردۆتەوە؟**

*لە رۆژنامەی گەلاوێژدا کە هەموو ژمارەیەك ئایەتێکی قورئانیم تەفسیر کردووە.

**—مامۆستا جگە لە تەرجەمەکردنی قورئانی پیرۆز هیچ بابەتێکی ئەدەبیتان تەرجمە کردووە بۆ کوردی؟**

*نەخێر.

**—ئاستی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی ئەمڕۆ چۆن دەبینن؟**

*بە ئاستێکی باش گەیشتووە پشت بەستن بەڵاوەکان ئەو کەم و کوڕیانەی کە هەیە پڕی بکەنەوە، چونکە هیوامان پێیانە.

**—لە ژیانی ئەدەبی خۆتاندا هەوڵی شیعر نووسینتان داوە؟**

*شیعرم نووسیوە، بەڵام من شاعیر نیم،شیعرەکانی منیش وەك شیعرەکانی جەلالەدینی سوفیی وایە کە ئەویش لەرێگەی مەلایەتیەوە شیعری داناوە، هەر بۆیە دەڵێم من شیعرم هەیە بەڵام شاعیر نیم.

**—دەربارەی نەبوونی زاراوەی کوردی لە بەرامبەر زاراوە بیانیەکاندا ئێوە دەڵێن چی؟ بۆنموونە وشەی ئەدەبی یاخود شیعر کە وشەیەکی عەرەبییە و تاکو ئەمڕۆ وشەیەکی دارێژراوی کوردی بۆ دانەراوە؟**

*بەدەستهێنانی ئەو زاراوانە ئەرکێکی سەرشان و پیرۆزە کە پێویستە کۆمەڵێك لەزمان زانەکان کۆ ببنەوە و زاراوە پێویستەکان بکەنە بەرنامەی داهاتوویان..

**—ئاواتی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ چییە؟**

*ئاواتی من ئەوەیە ئەدەبی کوردی گەشەبکات و هەموو واتاکان بە کوردی بنووسرێن، هەروەها ئەو زاراوانەی کە نیمانە بۆیان دابڕێژرێن تاکو ئەدەبەکەمان بەرەو پێشتر بچێت.

**—لەدوای فەرهەنگی خاڵ چەند فەرهەنگێك دەرچوون لەوانە ئەستێرەگەشە یان فەرهەنگی زانیاری، راتان بەرامبەریان چییە؟**

*لەو بڕوایەدام یەکێك قەواعیدی زمانی عەرەبی نەزانێت ناتوانێت کار لەدانانی فەرهەنگێکدا بکات، هەر بۆیە دەڵێم مەرجی دانانی فەرهەنگ زانینی قەواعیدە.

## لەچاپکراوەکانی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ

1—مەولودنامەی نووسەر 1937 چاپکراوە و پاشان دوو جاری تریش بەچاپ گەیەنراوەتەوە.
2—تەفسیری خاڵ شەش بەشە و بەشی یەکەمی لەساڵی 1969 چاپکراوە.
3—فەرهەنگی خاڵ سێ بەرگە و بەرگی یەکەمی لەساڵی 1960دا بەچاپ گەیەنراوە.
4—بابەتێکی زمانەوانی 1974 چاپکراوە.
5—پەندی پێشینان دوو بەشەو بەشی یەکەم لە ساڵی 1957 و بەشی دووەمی لە ساڵی 1971 چاپکراوە.
6—موفتی زەهاوی
7—ناڵەی دەروون دووبەشە و بەشی یەکەم لەساڵی 1984 و بەشی دووەم لەساڵی 1985 دا بەچاپ گەیەنراوە.
8—مەلا محەمەدی کاکی 1988
9—دەستنووسی کۆن 1986
10—شێخ محەمەدی نۆدێ بەزمانی عەرەبی 1961
11—البيتوشي 1958
12—مقدمة المؤلفات الصناعية 1967
13—تأريخ إمارات الكاكاكيه 1961
14—كنز اللسن
15—چەند دەستنووسێك بەسێ بەش لەساڵانی (1973—1974—1975).

**سەرنجێك**

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ خاوەنی دەستنووسێکی زۆرە کە ژمارەیان (630) دەستنووسە، دوو دەستنووسیان دوو دانەیان هەیە یەکیان لەلای مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵە دەستنووسێکیان لەساڵی (611)ی هجری نووسراوەتەوە وتەکانی پێغەمبەری لەخۆگرتووە، هەروەها مامۆستا لەبەرامبەر ئەو کتێبە عەرەبییەکانیدا لەلایەن کۆمەڵەی ئەدەبی ئەردەنیەوە وەك ئەندام وەرگیراوە.

**سەرچاوە**

گۆڤاری گەلاوێژی نوێ ژمارە (29)ی حوزەیرانی (2002).

# مامۆستا خاڵ و چاوپێکەوتن

محمد صالح ملا حسن



چلەی بێخود 1954

جگە لە پەیوەندی بە هێزی سۆز و خۆشەویستی و ئالودەیی ڕۆشنبیری کە ڕۆشنبیران و ئەدیبان ئەبەستێ بەیەکەوە و بە جەماوەری خوێنەرانەوە من ڕێزی تایبەتی بەینی مامۆستاو فەقێ و چاوهەڵهێنانی خوێنەواریم لە حوجرەی فەقێدا زیاتر ئەمبەستێ بە مامۆستای خاڵەوە و لێوەی نزیکم ئەکاتەوە شوێنەکە شوێنی ئەوەنیە باسی حوجرەی فەقی و ئەدەبی کوردی بکەم بەدرێژی، هەرچەن چەردەیەکی لەسەر نووسراوە بەڵام نەك بەتێروتەسەلی و پێویست ... لە کاتێکا گەلی کورد زۆرکەم نەبێ دەستی خوێنەواری ئەم لاولای لێ بڕابوو حوجرەی فەقێ ووردە ووردە بوو بە قوتابخانەیەکی خۆماڵی روت و چەنەها کەڵە شاعیری وەکو خانی و جزیری و مەولەوی و نالی و حاجی کویی و .... هتد وەك ئەستێرەی گەش لە ئاسمانی ئەدەبی کوردیدا ئەدرەوشانەوە.

پێش چەن ساڵێك کە ئەم بیست مامۆستای خاڵ بەرەنگاری نەخۆشیی چاوکزی و بێ هێزی و تەنیایی بوە کەوتمە پەروشی چاوپێکەوتنێك لە گەڵیا تاکات لە دەس دەرنەچوە وە ئەگەر دواتر بکەوتایە بە وشێوەیە نەئەکراو. ئەتوانم بڵێم ئیتر دوای ئەو چاوپێکەوتنە لە دواقۆناغی بەرهەم و نووسینا ئەژیا وەکاتی خۆی چاوپێکەوتنەکە بە عەرەبی بڵاوکرایەوە لە عێراقدا(1)

بە پێویستم زانی لەم کاتەدا کە ڕۆژانی چلەی ماتەمینیەتی چەن لایەنێکی ئەو چاوپێ کەوتنە بە کوردیش بڵاوبکەمەوە.. چونکە وابزانم دواچاوپێ کەوتنی ڕۆژنامەیی بوو لە گەڵیا.

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی کوڕی حاجی شیخ ئەمینی کوری شێخ محەمەدی خاڵە، لەنەوەی مەلا ئەبوبەکری(مصنف)ی شارەزووری گورانی یە، کە لە نەوەی شیخ محەمەد زاهیدی ناسراو بە(پیرخدری شاهۆ)یە، مامۆستای خاڵ ساڵی 1904ز لە دایك بووە، تەمەنی(9) ساڵ ئەبێ کە باوکی ئەمرێ، ئەکەوێتە ژێر چاودێری باپیری حاجی ئەمین، بابەتەسەرەتاییەکان و هەندێ زانیاری عەرەبی و ئایینی لای ئەو ئەخوێنێ لەگەڵ هەندێ نامەی فارسیدا.

پاشان خوێندن لای مامۆستایان مامۆستا شێخ جەلالی قەرداغی و مامۆستا شێخ عومەری قەرەداخی و مامۆستا مەلاحسەینی پیسکەندی تەواو ئەکا، لە ساڵی 1931ز باپیری ئەمرێ (متصرف) پاریزگاری سولەیمانی ئەحمەد توفیق بەگ لە ئاهەنگێکی رەسمیدا لە شوێنی باپیریدا دایئەنێ(ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامە (ژیان)ی ژمارە(28)ی 1931/6/11ز بڵاوکراوەتەوە) مامۆستا چەن ساڵێك بە دەرس وتنەوەوە خەریك ئەبێ لە ساڵی 1939 ئەبێ بە قازی دادگا، قەزاوەتی لە شارەکانی

سولەیمانی و هەڵەبجەو چەمچەماڵ و کەرکوك و موصل دا بینیوە، پاشان بوە بە ئەندامی(تەمیزی شەرعی) لە بەغدا لە ساڵی 1954ز بوە بە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عیراقی دوای ئەوەش بوە بە جیگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد و ئەمجا ئەندامی بەشەکوردیەکەی کۆڕی زانیاری عیراق.

لە ساڵی(1967ز) خانەنشین کراوە، مامۆستا خاڵ لە دەستەی یەکەمی نووسەرانی زمانی کوردی تازەیە لیهاتووی گەلی مەیدانی نووسین بووە وەکو چەندها نووسینی ئایینی و کۆمەلایەتی و خاوەنی دەستیکی بالای زمانەوانی بووە لە فەرهەنگەکەیا(فەرهەنگی خاڵ) کە کوردی کوردی یە نزیکەی چل هەزار وشەی لیك داوەتەوە، کە لە چاپی دووەمی(پەندی پیشینان)دا (3890)سێ هەزار و هەشت سەد و نەوەد پەندی کۆکردوەتەوە و بونەو چیرۆکی ئەوەی دەستی کەوتوە باسی کردووە، ئەمە جگە لە دانراوەکانی تری کە دوایی باسی ئەکەین، نووسینەکانی لە رۆژنامەی ژین و گۆڤاری گەلاویژ و هیواو رۆژی نوێ و بلیسەو سولەیمانی و بەیان و زانکۆو نەورۆز و پەروەردە و زانست و گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیرا ق بە هەردوو بەشەکەیەوە عەرەبی و کوردی بلاوکراوەتەوە.

پیش نیوەرۆی نەورۆز(1984/3/21)ز خۆم لەبەر دەرگای مالی مامۆستای خالدا دیەوەو زۆر تامەزرۆی بی نین و ووتو ویژبووم. لەژووری میواندا چاوریم ئەکرد مامۆستا دەرکەوت بەبالای لاوازی بەرزیەوە وجلی مالەوە. لەوکاتەدا خۆشی و ناخۆشی بەرەنگاری یەك بوونەوە خۆشی بەبینینی مامۆستا ناخۆشی گوبەندی پیری... ئەمووت خوزگە پیری لە لەشی رۆشنبیرو زانادا وابەزوویی هەواری نەگرتایە.

بە پیچەوانەوەی ئەوەوە کە زانرابوو لە مامۆستای خالەوە کەکەم قسەیەو هەروا ئاسان نیە بچیتە ناو شەخسیەتیەوە لە گەلما زۆر کراوە و بە قسەبوو رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە زانی من لەریزی قوتابیانی ئەودام، چەردەیەکم لە کانیاوی حوجرەی فەقێ نۆشیوە یان چاری نەمابوو ئەبێ دادگا لە دەستی پیری... چونکە گەلیك لەوتەکانی هەر لەوروەوە بوو، چەند پرسیاریکم لا دانا وادەم وەرگرت کە رۆژی دوایی برۆمەوە چەند وینەیەکی بگرم و دوای چەن رۆژیکیش بیمەوە وەرامی پرسیارەکانم دەسکەوێ بەنووسراوەیی(ئەم وینەیەی لەگەل ئەم وتارەدا بلاوبوەتەوە لەو وینانەیە) بۆ لیکۆلینەوەی هەندێ وەرامی جاریکی تریش رۆیشتمە خزمەتی زۆری پێ خۆش بوو ووتی دیارە ئەزانی بیرو هۆشم وەك جاران نیەو ئەتەوێ دلنیابیت ئەمەش لە خوارەوە هەندیك لەو وەرام و پرسیارانەیە:

***ئیوە لە دەستەی یەکەمی نووسەرانی زمانی کوردی تازەن چۆن مامۆستا رۆیشتە ئەم مەیدانەوە، لە کاتیکا -مامۆستا زانایەکی ئایین بوو، وە لەو ریگایەوە هاتە جیهانی رۆشنبیری یەوە؟**

-بێ گومان هەموو ئادەمیزادیکی ریك و راسال گەلی خۆی خۆش ئەوی وەحەز بە سەربەرزی و مانەوەی ئەکا، بەلام هۆی بنەرەتی کاریگەر لە جیهانی رۆشنبیری مندا نووسینەکانی(جمال الدین)ی ئەفغانی بوو کە یەکەم بلیسەی روونکردنەوەی بیرم بوو، چ لە گۆڤاری(العروە الوثقی)دا یان وتەجەمالیەکانی کە بە فارسی ئەینووسین لەو وتارانەدا بەرچاوم کەوت کە زمان گیانی میللەتە، کە زمان بوو گەل هەیە، کە نەبوو نیە ئەو دوو رستەیە رایان چەلەکانم و بیداریان کردمەوە تا ئەو کاتەش ئیمە خاوەنی فەرهەنگ نەبوین بەو شیوەیە گۆڤاری(العرە الوثقی) کە (جەمال الدین) بەریوەبەری بوو(شیخ محمد عبدە) سەرنووسەری بوو وەبۆ دەرکردنی شوققەیەکیان لە(پاریس) گرتبوو هەوینی بزووتنەوەی رۆشنبیریم بوو، وەکو هەزارانی وەك منی بیدار، کردبووەوە، گۆرانیکی هینا بەسەر هەست و بیرما کە چۆن سوود وەرگرم و سوود ببەخشم لە پیشا وام ئەزانی زانینی(گلنبوی برهان) و پەراویزی سەر (پینجوینی) و (ابن القرداغی) بەسە. سالانی زۆری تەمەنم لە پیناوی فیربوونیانا بردە سەر تا شارەزایان بووم. پەراویز(حاشیە)م لەسەر شەرح و پەراویزی (پینجوینی) نووسی چ لەسەر(گلنبوی برهان) چ لەسەر(گلنبوی ئاداب) (ئەو دووانە دووکتیبی بە نرخن لە دانراوەکانی شیخ زادە ئیسماعیلی کوری مستەفای گەلەنبەوین یەکەمیان لە زانینی(منطق)دایە دوومیان لە زانینی(مناظرە)دایە - نووسەری وتار-) دوای ئەوە بۆم دەرکەوت زانینی ئەوانە هەموو شتیك نین، ئیمە پیویستمان بە شارەزایی گەلی زانینی هاوچەرخ هەیە بە تایبەتی زمانەوانی.

***واباوە کە مامۆستا خاڵ وا لە تەواوکردنی پرۆژەیەکی ئەدەبی گەورەدا ئەویش کۆکردنەوە و لیکۆلینەوە و راڤەکردنی دیوانی شیخ رەزای تالەبانیە، چۆن مامۆستا لەو پرۆژەیە ئەدوێ؟**

-دەمیکە وام بە ئاواتی ئەوەوە کە دیوانی شیخ رەزای تالەبانی بە چاپیکی تازە چاپ بکەمەوە و بە شیوەیەکی تر هۆنراوەکانی ریك خەم و شەرحی لی بکەم. تاوەکو هەندێ قەرزی ئەو شاعیرەگەورەیە بدەینەوە و بۆیە زۆرم لە شیعرەکانی کۆکردۆتەوە کە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نیە، پیشەکیەکم بۆ دیوانەکە نووسیوە و نزیکەی(30) پارچە هۆنراوەم شەرح کردووە. بەلام بەداخەوە ئەوە چەن مانگە وازم لەو پرۆژەیە هیناوە چونکە چاوەکانم کزبوون و خویندنەوە و نووسینم لا زۆر گرانە و چاوەریی رەحمەتی خوام.

***بەرگی یەکەم و دووەمی (پەندی پیشینان) لە بازارا نەماوە ئایا مامۆستا چی ئەلی دەربارەی چاپ کردنەوەی؟ وە ئایا پەندی تازەی لەگەلا ئەبێ؟**

-کتیبەکە ئیستا ئامادەیە بۆ چاپ ژمارەی پەندەکانی گەیشتوتە(4/500) چوارهەزار و پینج سەد پەند، ئەوە سال و نیویکە لە کۆڕی زانیاریە هیوادارم زیاتر دوا نەکەوێ.



*چی پاڵی بە ماموستاوە نا بۆ ئەوەی تەفسیری قورئانی پیروز بکا بە کوردی، ئایا هەموو جزمەکانتانی تەفسیر کردووە، وە بۆچی ئەوەی کە چاپکراوە بە تەرتیب نەبوو.

-گەلی کورد گەلێکی موسوڵمانە بەلامەوە نەنگ بوو گەلێك(25)ملیون بێ لە کتیبخانەیا تەفسیری قورئانی پیرۆز بەزمانی خۆی نەبێ، ئەوە لەگەڵ خزمەتگوزاری ئەو گەلە دا بەئیسلام رێك ناکەوێ دەوری صلاح الدین کوردی ئاشکرایە لە مێژوودا کەچۆن وڵاتانی ئیسلامی پاراست لە پەلاماری بێگانەکان، نەبوونی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە کوردی عەیبێکە لەسەر شانی زانایانی ئایین. بۆیە دەسم کرد بە تەفسیرکردنی قورئان، لە ساڵی 1935 تەفسیری جزمی عەممەم چاپ کرد لە چاپخانەی ژین لە سولەیمانی نوسخەیەکم نارد بۆ عومەر وجدی بەرپرسیاری بەشی داخلی قوتابیانی کوردی دانیشگای ئەزهەر(رواق الاکراد) لە قاهیرە، لە وەراما نامەیەکی جوانی بۆ نووسیم دەربارەی گرنگی ئەو کەلێنەی پری کردوەتەوە، ئەمەویست تەفسیرەکەم بەتەرتیب و یەك لە دوای یەك بێت، بەڵام تەفسیری جزمەکانی(27،28،29،30)م پێش خست لەسەر داوای پەیمانگای ئیسلامی لە سولەیمانی و لە هەولێر، هەرچەن لەو چوارە تەنیا جزمی28،30چاپ کران.

*راتان دەربارەی ئەم قۆناغەی کە ئەدەبی کوردی تێدایە؟

-بێ گومان لە دوای جەنگی جیهانی دووهەمەوە تا ئێستا ئەدەبی کوردی بە گەلێ قۆناغی گوران و پێش کەوتندا رۆیشتوە ئێستا خاوەنی گەلێك دانراوی ئەدەبی و گۆڤار و رۆژنامەیە و توانیوویەتی بە پێوە رابوەستێ و لە قۆناغی گوڵ و گوڵ کردندایە.. وە هیوادارم لە پەرەسەندنابێ من بروام بەوە هەیە کە گەلی کورد، شاعیری سروشتیە کوریان و کچیان خویندبێتیان یان نەیان خوێندبێ ئەبینی گەلێ جار وتەیان شیعرە، بەو مەرجەی بە سوروشتی خۆیان بڕین، شیعر تەنیا ئەوە نیە لەسەر کێش و قافیەی عەروضی خەلیل بێت، ئەبینی گورانی شوان هۆرە بریتیە لە شیعری جوان و دڵگیر.

*پاشان وەرامی ماموستای خاڵدا دەربارەی دانراوە چاپ کراوەکانی و ئەوانەی ئامادەکرابوون بۆ چاپ بەم شێوەیە نووسرابوو.

-ساڵی 1933 جزمی عەممەمان بە کورتی و بەکوردی تەفسیر کرد لەسەر رێبازی خوالی خۆش بوو شیخ موحەممەد عەبدە..(دەربارەی ئەمە دوابن). هەر ئەم جزمەمان جاری دووهەم بە درێژی تەفسیرکردەوە لە ژێر ناو نیشانی تەفسیری خاڵدا .. لەگەڵ جزمەکانی تری قورئاندا.

2-تەفسیری خاڵ: تەفسیرێکی عیلمی و کۆمەڵایەتیە بە زمانی کوردی، هەولم داوە شێوەی نووسین هەم ئاسان و هەم جوان بێ لەگەڵ تێگەیشتنی لاوان دا ریك كەوێ، تائێستا چوار جزمی لێ چاپ کراوە لە سەرەوە ئایەتەکەمان نووسیوە و لە خوارەوە تەفسیرەکەی داوای یارمەتی ئەکەم لە خوای گەورە بۆ تەواو کردنی ئەم پرۆژە گەورەیەش کە جیگەی شانازی گەلی کورد ئەبێ.

3-تەفسیری سوورەی فاتحە: تەفسیرێکی کوردی درێژی ئەم سوورەتەیە بە (24) لاپەرە ساڵی 1955ز لە بەغدا لە چاپخانەی (معارف) چاپ کراوە.

4-فەلسەفەی ئایینی ئیسلام: نامیلکەیەکە بەکوردی دەربارەی فەلسەفەی هەندێ بابەتی دینی، ساڵی 1936ز نووسیم بەگوێرەی بەرنامەی (معارف)، لە چاپخانەی ژین لە سولەیمانی چاپ کراوە لە پۆلی شەشی سەرەتاییدا ئەخوێنرا.

5-مەولودنامەی نەوئەشەو. یا تاریخی پێغەمبەر: "نامیلکەیەکی کوردیە بەپەخشان و بەهۆنراوە لە ئاهەنگەکانی یادی لە دایك بوونی پێغەمبەردا ئەخوێنرایەوە لە جیاتی هەندێ نامیلکەی تر کە لە خەرافیات خاڵی بوو.

ئەمیش جارێك لە چاپخانەی ژین ساڵی 1932ز جارێکی تر لە چاپخانەی کامەران ساڵی 1937ز چاپ کراوە.

6–(البیتوشی): کتێبێکە بەزمانی عەرەبی بریتیە لە (304) لاپەڕە دەربارەی ژیانی زانای بەرز شێخ عبداللەی بیتوشی کوردیو شیعرە عەرەبیەکانیو بەرهەمو دانراوەی تری کە دەسم کەوتوە، لە دانانی ئەو کتێبەدا زۆر مانوو بووم قوژبنی کتێبخانەکان و دەسنووسەکان زۆر گەڕاووم لە کوردستانو بەسرەو زوبەیرو کویتو بەحرەینو (احسا ء) وەناوی گەلێك لە زانایانو ئەدیبانی کورد هاتوە لە کتێبەکەدا هیوادارم توانیبێتم هەندێ پایەی زانیاریو ئەدەبی ئەو زانا کوردەم دەرخستبێ.

7–شێخ معروف نۆدێ (الشیخ معروف النودهی) البرزنجی: کتێبێکە بەعەرەبی دامناوە دەربارەی ژیانی زانا شێخ مەعروف کوری شێخ مستەفای نۆدێ باوکی کاکە ئەحمەدی شێخ باپیری شێخ مەحموودی حەفید... بریتیە لە (200)لاپەڕە دەربارەی بنەماڵەی ئەو زانایە هەروا لە دایك بوونو پێگەیشتنو شیعرو پایەی شاعیریو زانیاریو پێنج خشتەکیەکانیو مەتەڵەکانی، هەر لەو کتێبەدا شتێکیشم دەربارەی شێخ خالدی نەقشبەندی نووسیوە، هۆی ناکۆکی بەینی ئەوو شێخ مارف، ساڵی 1963ز لە چاپخانەی (محمد صالح الاعظمی) لەبەغدا چاپ کراوە.

8–مفتی زەهاوی: کتێبێکە بە کوردی لە (144) لاپەڕەدا دەربارەی، ژیانی زانا (محمد فیضی الزهاوی) مفتی بەغدا.. و هەڵبەستە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسیەکانی دانراوو بەرهەمی عیلمی و ئەدەبی و چیرۆك و قسەی بەتویکڵی لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت و عیلم و ئەدەبدا، ساڵی (1953ز) لە چاپخانەی مەعاریف لە بەغدا چاپ کراوە.

9–فەرهەنگی خاڵ: بریتیە لە فەرهەنگێکی کوردی–کوردی لە (3) بەرگی گەورەدا بە هەموو شێوە کوردیەکانەوە کرمانجی سەروو و سۆرانی و هەورامی و لوڕی ئەردەڵانی و زازایی و فەیلی و بەختیاری، بریتیە لە لێکدانەوەی (40000) وشە. لە چاپخانەی کامەرانی سولەیمانی چاپ کراوون.

10–(پەندی پێشینان): تۆزێك قسەمان لێکرد کتێبەکە لەپەندی کوردیدا پەندەکانم بە گوێرەی پیتی (هجاء) ڕێك خستوە. لەپێشا لەبەغدا بە (200) لاپەڕە و (1311) پەندەوە چاپ کرا لەچاپخانەی مەعاریف ساڵی 1957، جارێکی تر لە سولەیمانی ساڵی 1971ز بە (506) لاپەڕە و (3890)پەندەوە چاپ کرا. ئێستەش ئامادەیە بۆ چاپی سێهەم لە کۆڕی زانیاری بە (4500) پەندەوە.

11–(المؤنثات السماعیه): کتێبێکە بە عەرەبی... دەربارەی موئەنەثە سەماعیەکان، بەپێی پیتەکانی ئەلف و بێ ڕێکم خستوە، کە نموونەم بۆ هێناونەتەوە بە ئایەتی قورئان یان وتەی یەکێکی عەرەبی زان، لە هەردوو بەرگەکەی (13) و (14)ەی گۆڤاری کوڕدا بڵاوکراوەتەوە.

12–(حلقة مفقودة من تأریخ البصرة او تأریخ الأمارة الافراسیابیه): کتێبێکە بەزمانی عەرەبی لە بەرگی هەشتەمی گۆڤاری کوڕدا بە (48) لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.

13–ناڵەی دەروون: کۆمەڵە وتارێکی ئاینی و زانیاری و کۆمەڵایەتیە لە (4) بەرگدا سیانیان کوردیە هەندێکی نەبێ لەگۆڤاری کوڕدا ئەینا چاپ نەکراوون (خوێنەر لێی ڕوونە کە ئەم چاوپێکەوتنە پێش چاپ کردنی دوو بەرگی ناڵەی دەروون بووە–ڕێکخەری) چاوپێکەوتن.

14–پەراوێز و پێشەکی نووسین بۆ کتێبەکەی زانا سەی ئەحمەد فائزی بەرزنجی، لەگەڵ چاودێری کردنی و ڕێك خستنی، کتێبەکە ناوی (كنز اللسن المكنوز فيه ستة السن واثنا عشر فنا) شتێکی عەنتێکەی زانیاریە بە (15)شێوە ئەخوێنرێتەوە لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراقە.

15–دەستوری زبانی کوردی: کتێبێکە بەکوردی دەربارەی نەحوو صەرفی کوردی چاپ نەکراوە.

16–کۆمەڵە وتارێکی شێوە تازەی جومعە: چاپ نەکراوە.

17–دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی: گەلێك لەشیعرە بڵاونەکراوەکانی بە هەر چوار زبانەکە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی– کۆم کردوونەتەوە هێشتا تەواو نەبوە– لەپێشەوە قسەمان لێکرد.

18–پەراوێز بەعەرەبی لەسەر نووسینی (عبدالرحمن)ی پێنجوێنی لەسەر کتێبی (گلنبوی برهان)ی عیلمی (منطق)ی ئیسماعیل گەلەنبەوی– چاپ نەکراوە.

19–پەراوێز بە عەرەبی لەسەر نووسینی (عبدالرحمن)ی پێنجوینی لەسەر کتێبی (گلبنوی اداب)ی ئیسماعیلی گەلەنبەوی لەعیلمی (مناظره)دا چاپ نەکراوە.

20–پەراوێز (حاشیه) بەعەرەبی لەسەر شەرحی (سید عبدالله) لەسەر کتێبەکەی (ابن حاجب) لە عیلمی صەرفدا کە ناوی (شافیه)یە چاپ نەکراوە.

21–پەراوێز بەعەرەبی لەسەر کتێبی (سعدالله)ی بچکۆلە لە عیلمی نحودا چاپ نەکراوە.

**پەراوێز**

1–ئەم چاوپێکەوتنە بەعەرەبی لە ڕۆژنامەی عیراق ی 1985/1/14م لە لاپەڕەی ڕۆشنبیری کوردیدا بڵاوکراوەتەوە.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی پاشکۆی عێراق، ژ(99)ی ڕۆژی 1989/8/23.

# ناڵەی دەروون

(جزمی سێیەم)

**کۆمەڵە وتارێکی سیاسی و نەتەوەیی و بایەخداری مێژوویە برێك لە جانەوەرێتی کاربەدەستانی عێراق بەرامبەر کورد رسوا ئەکات**

**دانانی: شێخ محمدی خاڵ**

**ئەندامی کۆڕی زانیاریی عێراق و جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاریی کورد**

**2610ك**

**1998ز**

چ ڕۆژێکی ڕەش بوو

ڕۆژی 1963/6/9 تا ڕۆژی 1963/6/13 ڕۆژێك بوو وەك موچڕکی تادار، یا وەك چۆقەی لەرزدار، بەڵکو وەك تەکان و لەرزەی بوومەلەرزە وابوو، گەورە و بچووك و بەرز و نزمی وەك یەك هێنایە جونبوش و لەرزین. لەسەعات چواری بەیانییەوە لەهەموو شاری سلێمانی و کەرکووك و هەولێردا هاتنە دەرەوە و هاتوچۆ قەدەغەکرا و تەلەفۆن لە هەمووماڵێك برا، کەس ئاگای لەکەس نەما و هەموو کەسێك دەرگای لەخۆی خاکرێز کرد وەك مەلێکی پەل و باڵ شکاو خۆی و ماڵ و منالی توروشکەیان کرد. ئەژنۆیان نا بە سنگیانەوە و چاوەڕوانیان ئەکرد بزانن چ بەڵایەك یەخەگیریان ئەبێ، یا چ خەموخەفەتێکی تازە بەتازە ئەبێ بە میوانیان.

شاری سلێمانی چل و یەك سەعات لەسەر یەك بوو بە شاری خامۆشان، جارێ واز لەوە بێنە کە لەسەد ماڵا حەفتاوپێنجی نەنان و نە ئارد و نەدانەوێڵە لەماڵیا نەبوو، وە ئەوەی بەڕۆژ پەیدای نەکردایە و لەبازاڕا نەی کڕیایە نەیبوو بیخوات. لە هەموو لایەکیشەوە تەقە دەستی پێ کرد، دەمێ گرمەی تۆپ دەمێ تەقەی تفەنگ دەمێ قرمەی شەستیر، وە لەپەنجاڵاوە سەرباز و ئەفسەر بڵاو بوونەوە. ماڵ بەماڵ دەستیان کرد بە پشکنین بۆ چەك و بۆ زەلام، لەبەر هەر ماڵێك سێ چوار لۆری سەرباز و ئەفسەر دائەبەزین بەشەستییر و تۆمیگەنەوە دەپانزەیەکیان ئەچوونە ژوورەوە و ئەوانیکەی تر دەوری خانۆکەیان ئەدا لەکۆڵان و سەربانەوە. ئەوانەی کە ئەچوونە ژوورەوە ئەگەر زۆر زوو دەرگایان لێ نەکردنایەتەوە دەستڕێژیان لێ ئەکردن، وە بەم بۆنەیەوە بگرە تاپێنج سەد کەس کوژرا(1). لەپاشا دەستیان ئەکرد بەماڵ پشکنین وە داریان بەسەر بەردەوە نەئەهێشت، تەنانەت جل و بەرگی ژنانیان هەڵ ئەتەکان و دەستیان ئەکرد بەکووپە ر گۆزەدا و هەرچیەکیان بەردەست بکەوتایە لەپارەو زێڕ و شتی بەنرخ بەدزی و بەئاشکرا ئەیان برد. هەموو سەربازێك دەپانزە ئەموستیلەی ئاڵتونی ژنانەی لەپەنجەدا بوو، وە باخەڵی پڕ بوو لەبەستەدینار، ئەمانە هەمووی لەگەڵ جنێودان و تووڕە بوون و قسەی ناشیرین وتنا. ئنجا لەم پشکنینەدا هەر پیاوێکی گەورە یا خوێندەوارێکی کاربەدەست یا گەنجێکی زۆر بەهێز کە لەوانە بێ دەست بداتە چەك ئەیانگرت، خۆ ئەگەر چەکیان بدیایە ئەوە هەر باسی سەر بوو. گەڕەکەکانی قەراغ شاری سلێمانی درایە بەرتۆپ و دانیشتووانی دایانە دەشتەکە. خۆلاسە لەڕۆژی یەکەم و دووەما سێ چوار هەزار کەس گیران بەهەموو حاکمەکان و دکتۆرەکان و سەرۆکی دائرەکان و مامۆستاکانەوە، وە بەپێی پەتی و بێجامەوە ڕاپێچیان کردن. وە هەرچی تاولەو تەویلەی عەسکەریی بوو پڕکرا لەمانە. تاوڵەیەك کە جێی چل ئێستر بووبێ، شەش سەد کەسی تێ خزێنراوبوو، پێنج شەش هەزار کەسیش لەترسانا هەڵاتبوون. ڕۆژی سێیەم کە چەند سەعاتێك ڕێگا کرایەوە و خەڵق لە برسانا هاتنە دەرەوە، لەسەر شەقامەکان هەرچیەکت ئەدی یا منال یا پیرەمێرد یا پیرێژن بوو. لەمانە لەهەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کە سەرباز و ئەفسەر لەو دوو سێ ڕۆژەدا بازاڕیشیان تالان کرد و هەرچی کۆگا و دوکانی زەڕەنگەر و پارەدار و کوتاڵ و زەخیرە بوو وەك لەوەپێش دەستنیشان کرابن هەموویان شکاندبو، وە بە لۆری عەسکەریی گوێزرابوونەوە. لەمەش ناخۆشتر ئەم سێ چوار هەزار کەسە کە گیرابوون خواردنیان نەدانێ، ناچار دەنکە جۆی ناو تەرسی ئێسترەکانیان ئەخوارد کە دۆشەك و ژێر خەریان بووە. وە دووسەد گەنجێکی منال کاریان لە ڕۆژی سێیەمدا لەبرسانا بووردنەوە، وە بەو ڕەنگە دە پانزە سەعات مانەوە.

ئەم سێ چوار هەزار کەسە لەسەر ئەرزێکی ڕەق و تەق لێی کەوتن، ئەوی ناو ئاخوڕێکی دەست بکەوتایە ئەوا لە هەموو لایەکەوە بەچاوەوە ئەکرا، تا هەموو میزیان بوو بە خوێن و تووشی زەحیریی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەلێکیشیان دان. بەڵام لەمانە لە هەمووی ناخۆشتر و نارەواتر ئەوەبوو کە لەپاش دوو مانگ بەردانیان دەرکەوت کە (86) کەسیان لێ کوژرابوو، بەبێ ئەوەی کەسوکاریان بیان بینن یا بزانن چۆن کوژراون و چییان لێ کراوە، بەڵام ئەوەندە زانرابوو کە زەلامی کوژراوی زۆر فڕێ درابوونە ناو شییوەڵۆکەکانی لای حامیەوە و سەگ ئەیخواردن. تەنانەت سێ چوار لادێیی لەخوار شاری سلێمانییەوە چاویان بەپەلی زەلامێك کەوتبوو بەدەم سەگێکەوە هێشتا سەعاتەکەی لەدەستا مابوو.

سەیر لەوەدا بوو کەس نەی ئەوێرا قسەبکات، یا بڵێ ئەمەندە و ئەوەندەم براوە، یا دوکانەکەم تالان کراوە، یا کورم یا برام کوژراوە، یا یەکێك سکاڵانامەیەك بۆ کەسێکی گیراوی خۆی بدا، یا بوێرێ خواردەمەنییەکیان بۆ ببات. وەك ڕۆژی (قیامەت)ی لێ هاتبوو کەس سەر کەسی نەئەپرژا.

ڕۆژی 1963/7/4 سێ سەد کەسیان لێ بەردان. کەهاتنە دەرێ هەموو کەسوکار و خزم و خوێشیان لەسەر ڕێیان وێستابوون، کەچی کەس کەسی خۆی نەئەناسییەوە، چونکە هەموو ژاکاو و تێقوپا و چڵکن و کوڵکن و دەست و پێ کرێشاوی و سەرو ریش هاتوو. ئەوی بێجامەی سپی لەبەردابوو بێجامەکەی وەك دەواری لێ هاتبوو، سا مەگەر ئەوان کەسوکاریان بانگ بکردایە. لەپاش ئەوەی یەکترییان ناسیەوە بوو بەگریان‌و شیوەن‌و شەپۆڕ بەڕەنگێکی وا هەرچی چاوی پێیان ئەکەوت دەستی ئەکرد بەگریان. ئەو سلێمانی‌یە خۆشە بوو بوو بەدۆزەخ. لەگەڵ لەدەرگا ئەدرا موچڕکێك بەتەپڵی سەرتا ئەهات لەکەڵەموستی پێتەوە دەرئەچوو، دڵ ئەکەوتە تەپە تەپ‌و گورپە گورپ، وەهەرچی لەماڵا بوو خێرا هەموو ئەچوون بەدەنگ دەرگاکەوە، تاهەموو زوو بزانن کێ بوو هات. خۆ شاخەو شریخەی تۆپیش کەناو بەناو بەسەر ماڵانا ئەتەقێنرا زۆر ژنی سکپڕی بەراویتە کردو منالی نەخۆش خست لەترساناو زۆر کەس شێت‌و کەلەیی بوو، وە هەرچی نەخۆشی دڵی بوو لەو چەند ڕۆژەدا هەمووی مردن‌و بەجێیان هێشتین.

نازانم قەت یادی بەهەشتت کردووە کەلەهەموو لایەکەوە باخ‌و باخات‌و دارو درەخت‌و سێبەرو ئاوو هەموو جۆرە میوەو خواردەمەنییەکی پاکو تەمیز، لەگەڵ کەیف‌و خۆشی‌و پێکەنین‌و ئازادی‌و دڵنیایی‌و کامەرانی. لەپڕ پڕبێ لەزەبانییەی دۆزەخ‌و بەزۆر داگیری بکەن‌و سێبەرەکەی بکەن بەهەتاوی سوورو ئاوی بەگەڕاوو دڵنیایەکەی بەترس‌و بیم‌و خۆشییەکەی بەناخۆشی‌و رابواردنەکەی بەتەنهایی‌و گۆشەگیریی‌و بێ وەییەکەی بەجەنگ‌و ئاژاوەو نازو نیعمەتەکەی بەگرانی‌و قاتوقڕ. شارەکەی سلێمانی کەجاران چوار وەرزە پڕ بوو لەمیوە وای لێ هاتبوو دەم تەرکەرەی تیا نەمابوو، یەك دەنك بامێ یاتەماتە یاسێو یا هەڵووژە یاترۆزی یا خەیار یاهەر میوەیەکی‌تر بەهیچ جۆرێك دەست نەئەکەوت. ناچار لەجیاتی هەموو جۆرە میوەیەك هەر کەوەرو کەرەوز ئەخورا، تا تەندروستی بەتەواوی نەڕووخێ.

جاران کوردستان ڕۆژ بەڕۆژ لەبەرزبوونەوەو سەرکەوتن‌و پێشکەوتندا بوو، ساڵ بەساڵ خوێندەواریی زۆر ئەبوو، وە هەژاریی کەم ئەبوو، بەرە بەرە مەردوم ئەبووژایەوەو ساڵ بەساڵ دەغڵ‌و دان‌و لۆکەو توتن‌و مەڕوماڵاتی زۆرتر ئەبوو، رەزە وێرانەکانی ئاوا ئەکرانەوەو باخ‌و باخاتی لێ زیاد ئەکراو دارو دارستانی کەمتر ئەبڕرا. زۆر کەس لەشارەکانی کوردستان خانووی ڕێکوپێکی لێ دروست کرد، وەهەموو کەسێك ئەیویست بەپێی خۆی ماڵ‌و حاڵێکی ڕێك بخات‌و بەخۆشی ژیان بەرێتە سەر. بەڵام کتوپڕ لەتەموزی ساڵی 1958ەوە بەرە بەرە دێوەڵووکەی بیابان ڕێگای پێ گرتن‌و مۆتەکەی زۆرو ستەم لەجێگاو ڕێگای باوو باپیرمانا سوارمان بوو، وە شەوەی تەمەع‌و خودسەریی (استبداد) لەکۆشی دایکی نیشتمانمان دەستی نایە بینە قاقامان بۆ خنکاندن‌و تاساندنمان. بەڵام لەچواردەی ڕەمەزانی 1963وە زۆر بەنامەردانە دەستیان دایە یەخەمان. هیچ کوردێك کەلەماڵ چۆتە دەرەوە بەتەمای خۆی نەبووە تا هاتۆتە ماڵەوە، چونکە حەرەسێکی قەومی زۆر بەئاسانی ئەیتوانی بیکوژێ‌و بڵێ تفەنگەکەم لەدەست دەرچووە، هەر وەك بەم ڕەنگە زۆر کەسیان کوشت بەبێ تاوان. هەموو کوردستان پڕ بوو بوو لەدز بەناوی سەربازەوە، لەگورگی هار بەناوی ئەفسەرەوە. قەت بووە وەرتەی کاشان و کرمانی سێ هەزار دیناریی بکڕن کەچی دە دینار بدەن بەخاوەنەکەی، خۆ ئەگەر قسەشی بکردایە ئەیانگرت‌و لەبەندیخانە توندیان ئەکردو دەستیان ئەکرد بەلێدان‌و ئازاردانی تادوو سەد سێ سەد دیناری تریشیان لێ ئەسەند ئینجا بەریان ئەدا، هەروەك هەزاران فەردە کووتاڵ‌و شەکرو سندوقە چایان داگیرکرد. دوو سێ هەزار دێ لەکوردستانا وێران‌و تالان کرا. تەنانەت مریشك‌و کەڵەشێرو قەلەکانیشیان بەلۆری ئەهێنایەوەو بەشەو لەنادی مووسڵ‌و هەولێرو کەرکوك‌و سلێمانی دا ئەکرا بەمەزەو ئەخورا. دانیشتوانەکەشیان ئەوی کوژرا کوژراو ئەوی لەبرسانا مرد ئەوا مردو ئەوی دەریش چوو بڵاوبوونەوە بەهەموو وڵاتا بەسواڵکەری، لەزستانا بەڕووتی‌و بەسکی برسی، شەو لەکۆڵانانا خۆیان حەشار ئەدا.

ڕووس بەرووسی خۆیەوە لەجەنگی یەکەمی جیهاندا هاتنە پینجوین دەستیان لەیەکیك نەداو دەستیان بۆ پەرە جگەرەیەك دریژ نەکرد، بەڵام ئەمان شاری پینجوین یان بەتۆپ‌و بۆمبا سووتاندو تەختیان کرد کەهەزارو دوو سەد ماڵ بوو، وە دوانزە مزگەوت‌و هەزارو دووسەدو پەنجا قورئانی تیابوو. لەپیشەوە هەرچی لەشارەکەدا بوو لەکوتاڵ‌و شەکرو چاو دەغڵ‌و ناو ماڵ، لەگەڵ قالیی‌و لاکیشی مزگەوتەکان تالانیان کردو، بەلۆری عەسکەریی ناردیانەوە بۆ بەرەو خوار، ئینجا تەختیان کرد. دەك خوابتان کا بەقوربانی جوولەکەکان، کاتیك کەکوردستانیان بەجێ هیشت، فەرش‌و بەرمالی کەنشتەکانیان نەبرد لەگەڵ خۆیاندا، وەلەشوینی خۆی بەجییان هیشت چونکە بەمالی خانەی خوایان ئەزانی، کەبۆکەس دروست نییە دەستی بۆ بەرێ.

پیم باوەر بکە (بەگەورەیی خوا) کەوتەی چواردە ئەبیەم موچرکم پیادێ، من وائەزانم ئەمە هەزاران سالە مەردوم بەهەلەدا چوون کەژمارەی سیانزەیان بەنەحس زانیوە، چونکە لەچواردەی تەموزو رەمەزانەوە دەرکەوت کەهەر نەحسی چواردەیە یەخەگیری سیانزەش بووە. دەك هەرچی چواردە هەیە لەجیهاندا خوا بیکات بەقوربانی تاقە سیانزەیەك.

ئەم هەموو زۆرو ستەمەی کەکران لەکوردستانا نەبۆ خوا بوو نەبۆ نیشتمان بوو، بەڵکو زۆرو ستەمی ئادەمیی لەبرای هاوخوێن‌و هاودینی خۆی. بەڕاستی ئادەمی ئێستاش هەر ئادەمیی دەوری ئەشکەوت‌و جەنگەڵستانی هەزار ساڵ لەمەو پێشە کەدزییان ئەکرد تابیخۆن‌و پیاویان ئەکوشت تابژین‌و مەردومیان ئەفڕاند بۆ ئەوەی بیانکەن بەبەندە تازاڵ بن‌و خود سەرییان ئەکرد تافەرمان داربن، هیچ حەلێك یاسا یەکێکی نەپاراستووە لەیەکێك‌و هیچ دەمێك پەیمان گەلێکی نەپاراستووە لەگەلێك. ئەگەر دین‌و شارستانێتی‌و زانین‌و دەستوریش ئەڵێیت ئەوە کیفێکی ئاڵتونە بەسەر کەڵبەوەو بۆیە یەکی ئاڵە بەسەر نینۆك‌و چنگەوە.

بەڕاستی زۆر دەمێکە گەلی کورد کەمتەرخەم‌و گوناهبارە، بەڵام پێشمەرگەکان بەسەرۆکایەتی کاك مەلا مستەفای بارزانی ئەم گوناهە گەورەیەو ئەم تاوانە زۆرەیان شتەوە بەئارەقی خۆیان وە قەباڵەی کوردستانیان نووسی لەبن تاشە بەردەکان‌و لەناو ئەشکەوتەکانی سەر شاخەکانا بەخوێنی گەشی خۆیان. ساخوا ئیتر رەحمێك، ئەوەندەمان ئازارو سزا چەشت تا ئازار ترسی لێ نیشت‌و ئەمەندەمان دان بەخۆدا گرت‌و خۆڕاگرت تاخۆڕاگرتن دەستی کرد بەهاوارو گریان وە ئەمەندەمان قوربانی دا تاهەموو بووین بەقوربانی.


من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

مخطوطات مكتبة الشيخ محمد الخال في السليمانية

العضو العامل : الشيخ محمد الخال

مستلة من المجلد الثالث ، العدد الاول
من « مجلة المجمع العلمي الكردي »

مطبعة المجمع العلمي الكردي
بغداد ـ ١٩٧٥


من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

مخطوطات مكتبة الشيخ محمد الخال في السليمانية

العضو العامل : الشيخ محمد الخال

مستلة من المجلد الثاني ـ العدد الثاني من
« مجلة المجمع العلمي الكردي »

مطبعة المجمع العلمي الكردي
بغداد ـ ١٩٧٤


من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

مخطوطات مكتبة الشيخ محمد الخال
في السليمانية

العضو العامل : الشيخ محمد الخال

مستلة من العدد الاول من
« مجلة المجمع العلمي الكردي »

مطبعة المجمع العلمي الكردي
بغداد ـ ١٩٧٣

